ناوی کتێب: کێشەی دیموکراتیزەبوون لە تورکیا، مۆدێلەکانی چارەسەری لە کوردستان
)نەخشەی ڕێگا(
نووسینی: عەبدوڵڵا ئۆجەلان
وەرگێران: گۆڤاری ڕۆژی وڵات
چاپ: تشرینی یەکەم/ 2011
تیراژ: 2500 دانە
نرخ: 2000
چاپخانەی: ڕەنج



کێشەی دیموکراتیزەبوون لە تورکیا، مۆدێلەکانی چارەسەری لە کوردستان
)نەخشەی ڕێگا(

ناوەڕۆك

وتەیەکی پێویست

خوێنەری بەڕێز، ئەم پەرتوکە کە بەناوی"کێشەی دیموکراتیزە بوون لەتورکیا، مۆدیلەکانی چارەسەری لەکوردستان"ە، وەکو نەخشە ڕێگا بۆ چارەسەری دۆزی کورد و پرسی دیموکراتیەت لە تورکیا لەلایەنی بەڕێز"عەبدوڵڵا ئۆج ئالان" ڕێبەری کۆماجڤاکێن کوردستانەوە لەهاوینی"2009" ئامادە کراو پێشکەشی دام و دەزگا پەیوەندیدارەکانی دەوڵەتی تورکیای کرد. واتە هاوکات بوو لەگەڵ ئەو قۆناخەی کە حکومەتی تورکیا ناوی نابوو قۆناخی کرانەوەی دیموکراتی، بەڵام حکومەتی تورکیا بۆ ماوەی ساڵێك زیاتر ئەم پرۆژەیەی رادەستی پارێزەرانی ڕێبەری کەجەکە "kck"نەکردو بۆ راگەیاندنەکانیش ئاشکرای نەکرد، کە ئەمە بۆ خۆی پێشێلکردنی یاساکانی تورکیا بۆ خۆی بوو، چونکە بە پێی یاساکانی تورکیا و پێوانەکانی ئەوروپا هەرکەسێکی زیندانیکراو دەتوانێت لەرێگەی دادگاوە بیرۆ بۆ چوونەکانی بیگەیەنێتە دەستی پارێزەرەکانی بۆ تێهەڵچوونەوەی دادگا یا خود سەبارەت بەو پرسەی کە لەسەری بەند کراوە، بەڵام تورکیا ئەم پێوانانەی پێشێل کرد.
دواتر بەهۆی فشاری زۆری گەلی کورد و پارێزەرانەوە، تورکیا ناچار بوو کە"نەخشە ڕێگا"کە بداتە دەستی پارێزەران و ئەوانیش بۆ رای گشتیان راگەیاند. ئێمەش لەبەر گرنگی بابەتەکە و ئەو تێزەی بۆ چارەسەری پێشی خستووە بە باشمانزانی وەریگێرینە سەر زمانی کوردی و بەو هێوایەین کە هەموو لایەك سوودی لێ ببینن بۆ چارەسەرکردنی پرسەکان لەسەر ئاستی کوردستان و ئێراق.

پێشەكی:
ئەم نەخشەی ڕێیە لەكاتێكدا پێشكەشدەكەم كە گفتوگۆكانی دیموكراتیزەبوون لە توركیا چڕبۆتەوەو كێشەی كوردیش بنەمای ئەو گفتوگۆیانە پێكدێنێت. وەك پێویستیەكي بەرپرسیارێتی سەرشانیشم ئەو گەڵاڵەنامەیە لە قۆناخێكدا پێشكەشدەكەم (لە ساڵی2009) كە بەڕێز عەبدوڵڵا گول ی سەرۆك كۆمار بەبایەخەوە جەخت لەسەر "یان چارەسەر دەبێت یان چارەسەر دەبێت" دەكاتەوە. هەروەها بەهۆی ئەو هەڵوێستە روونانەی سەرجەم دامەزراوە سەرەكییە پەیوەندیدارەكان بە ئاسایشی دەوڵەتەوە پیشانیانداوە؛ لەگەڵ ئەو نرخاندن و بانگەوازیانەی بۆ من كراون پێشكەشكردنی ئەو هەڵسەنگاندنانەی بایەخدارتر كردووە.
شانبەشانی ئەو داواكارییە نووسراو و زارەكییانەی لە سەرەتای ساڵانی"1990"دا بەڕێز توركووت ئۆزال، لەساڵی"1997" یشدا لەلایەن سەرۆك وەزیری ئەوكات بەڕێز نەجمەدین ئەربەكان و ئەو پەیام و زانیاریانەی لەبەشی پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانی سوپاوە سەبارەت بەهەمان بابەتەوە دەهاتن، هەروەها ئەو چاوپێكەوتنانەی لەساڵی"1999"دا لەقۆناخی دەستگیركردنمدا لەكاتی لێكۆلینەوە دە رۆژیەكەو دوای قۆناخی لێكۆلینەوە لەگەڵا هەندێك لەكاربەدەستان ئەنجامدران، ئەو نامەو هەڵسەنگاندنانەی بۆ هەندێك لەكاربەدەستانم ناردبوون، هەروەها لەگەڵ زیاتر ئاشكرابوونی مەیلەكانی كۆمار، كاریگەرییان لەسەر پێشكەشكردنی ئەو گەڵاڵەنامەیە هەبوو.

بەشی یەكەم: دەستپێك

بە درێژایی مێژوو كێشەی دیموكراتیزەبوون لە ئارادا بووە، وەك ئەوەی زۆرجار ئاماژەی بۆ دەكرێت دیاردەیەك نییە لەگەڵا مۆدێرنیتەی ئەوروپاوە دەركەوتبێت. چونكە مەیلە دیموكراتییەكان بەردەوام لەسروشتی كۆمەڵگاكاندا هەبووە. لەناوەڕۆكدا دیموكراسی پەیوەندی بەو دەستپێشخەری، پەلامارو دیاردەی بەڕێوەبەرایەتیەوە هەیە كە لەهەر كەینونەیەكدا تێبینی دەكرێت. لەو پڕوایەدام كە ئەمە تێڕوانینێكی گەردوونییە.
لەمێژووی شارستانیەتدا بەتایبەتیش لەقۆناخی سەرەتای سۆمەریەكاندا سەلمێنراوە كە دامەزراوەی ئەنجوومەنی پێكهاتوو لەوتەبێژی كۆمەڵگای كشتوكاڵی و خەڵكی شار، رۆڵێكی گرنگییان گێڕاوە. راستیەكی حاشاهەڵنەگرە كە دامەزراوە دیموكراتیەكانی دەستپێك، لەشارەكانی سۆمەر بووە نەك لەگریك ـ ئەسینا . بەپێی تێپەڕبوونی كات لەگەڵ زیادبوونی رۆڵ و قورسایی راهیب، بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و چەكداری لەناو بەڕێوەبەرایەتیدا، دامەزراوە دیموكراتیەكان كەوتنە پلانی دووەم و گرنگی خۆیان لەدەستدا. لەسەردەمی نەمرودو فیرعەوندا كە سەردەمی پادشا ــ خوداوەندەو هەموو كەسێك وەك" كۆیلەی خولقێنراو" وەسف و ماناداركراوە، چیتر ناشێت باس لە دامودەزگای دیموكراتی بكرێت. قۆناخی هاوشێوە لەهەموو شارستانیەتەكان جێگای باس بووە. دوا نموونەكانی چاخی یەكەمیش لەئەزموونەكانی دیموكراتی ئەسینا و كۆماری رۆمادا دەبینین.
هەرچەندە لە قۆناخی دەستپێكی كرستیانی، واتە ئەو سەردەمەی هێشتا ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی وەك ئایینی فەرمی خۆی قبووڵ نەكردبوو، هەروەها لە ساڵەكانی سەرەتای ئیسلامدا، هەندێك فاكتەری دیموكراتی لە چاخی ناوبندا گرنگیشیان پێدرابێت، بەڵام بەهۆی بەهێزی نەریتی ئیمپراتۆری بەخێرایی كاریگەری ئەو فاكتەرانەی نەهێشتووەو لەمیانەی بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی و وشك، درێژەی بە هەبوونی خۆی داوە. لە كیشوەری ئەوروپاش دامەزراوە نوێیەكانی شارە كە لە سەرەتای ساڵەكانی (1000)وە دامەزران، بۆ ماوەیەكی درێژ لەرێگای نەریتی دیموكراتیەوە بەڕێوەچوون. ئەو شارانە ماوەیەكی درێژ لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەرەبەگایەتیەوە، ناچار بوون دەزگا دیموكراتی و سەربەخۆكانیان بپارێزن. لە بەرخودانی میرو كۆمەڵگا سەربەخۆكانی لادێ بەرامبەر بە رژێمەكانی پاشایەتی فاكتەرە دیموكراتییەكان رۆڵێكی گرنگییان گێڕاوە.
لە سەدەی (15) بەدواوە دوای گۆڕانی پاشایەتی بۆ مۆنارشی رەها، هەروەكو شارستانییە نەریتیەكان تا رادەیەكی زۆر دامودەزگا دیموكراتیەكانیشی لەدەرەوەی بازنەدا هێشتەوە. وەك نەریتێكی دیموكراتی تەنیا ماگناكارتا هەبوونی خۆی پاراستووە كە لە لە ساڵی (1216)دا بە فەرمی بەسەر پاشایەتیدا سەپێنرا. وێڕای ئەوەی شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا لە ساڵی (1789)دا وەك شۆڕشێكی گەل لە بەرامبەر مۆنارشی رەها دەستی پێكرد، بەڵام بە تێپەڕبوونی كات بۆ دیكتاتۆریەتی بورژوازی گۆڕا. ئەو دیكتاتۆریەتە بەشێوەی (دەوڵەت ـ نەتەوە) رێكخستەبوو و خۆی بە دەسەڵاتێكی سەرووتر لە دەسەڵاتی مۆنارشی رەها پڕ چەك و تەیاركرد. لەمیانەی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووكانەی لەئەنجامی سیاسەتی پەرتكە – زاڵبەی بریتانیاوە زیادیان كرد

ستاتۆیەكی هاوسەنگ لە ئەوروپا هاتە ئاراوە. وێڕای سەرجەم بانگەشە لیبڕاڵیەكانیان، تەواوی ئەو ڕژێمانەی لەچوارچێوەی دەوڵەت – نەتەوە بەڕێوەیان دەبردن خاوەن كارەكتەری ڕژێمی ئۆلیگارشی بوون كە لەلایەن چینێكی بژاردەوە بەڕێوەدەچوون. دەزگاكانی ئەو كاتەی پەرلەمان، هیچ كاتێك نەیانتوانی دەسەڵات و باڵادەستی نوخبەی ئۆلیگارشی لەناوبەرن. بێگومان ئەو دەزگا دیموكراتیانەی كە لە سەر بنەمای تێكۆشانی درێژخایەنی خەڵكی شار و گوند دامەزراون، ئەوانیش هیچ كاتێك بە تەواوەتی لەناو نەبراون. لەو سۆنگەیەوە ئەو دیموكراسیانەی تا ئەمڕۆ لە ئەوروپا بوونیان هەیە، دیموكراسیەتێكی چینایەتییە كە لە ژێر كۆنترۆڵی ئۆلیگارشی بورژوازیدایەو ناوەڕۆكە گەلەریەكەی سنووردارە. وێڕای ئەو هەوڵانەی دوای ساڵەكانی (1950) لەچوارچێوەی یەكێتی ئەوروپاوە بۆ ئاواكردنی كۆنفیدراسیۆنی یەكێتی دیموكراتیك دەدرێت كە دەوڵەت ـ نەتەوەش دەرباز دەكات، بەڵام نەیتوانیوە پاوانی ئۆلیگارشی دەوڵەت ـ نەتەوەكان بشكێنێت. ئەزموونەكە گرنگە، بەڵام چانسی سەركەوتنی مسۆگەر نییە.
وەك ئەوەی لەتەواوی جیهاندا ڕوویداوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش كەوتە ژێر كاریگەری ئیمپراتۆریەتی بریتانیاو زلهێزەكانی دیكەی ئەوروپا كە لەسەر بنەمای شۆڕشی پیشەسازی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە هەژموونگەرایی خۆی مسۆگەر كرد. ئیمپراتۆریەت كە لەسەر بنەمای نەریتی كۆنی دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی ناوین دامەزرابوو، لە بەرامبەر پێشكەوتنی خێرای چەمكی دەوڵەت ـ نەتەوە، بۆ ئەوەی لەناو نەچێت، خوازیاربوو لەسەر بنەمای بیرۆكراتی خۆی نوێبكاتەوە و بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەیەكی ناوەندی و تۆكمەتری عوسمانی بگۆڕێت. بە توندی هەوڵی سەركوتكردنی ئەو سەرهەڵدانانەی دا كە هاتنە ئاراوە. لە ئەنجامدا پێكهاتەیەك لە ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیای ئەمڕۆ لە میراسی ئیمپراتۆریەت مایەوە كە زۆرینەی لە نەتەوەكانی تورك و كورد و گەلێك پێكهاتەی ئەتنیكی تر پێكدێت، وەك كۆماری توركیا ئاواكراوە. لێرەدا ڕۆڵی بەرچاو ئیمپراتۆریەتی بریتانیا گێڕاویەتی. ئەو پێكهاتەیەی ناوی بۆرژوازی توركی لێنرابوو و لە میللەتە جیاوازەكان پێكهاتبوو، لەسەرەتاكانی سەدەی بیستەم بەشێوەی پارتی ئیتیحادو تەرەقی خۆی لەناو دەوڵەتدا ڕێكخست و لەمیانەی نەتەوەپەرستیەكی وشكەوە سەرەتا لەقۆناخی مەشروتیەتی دووەم دواتریش لە ڕژێمی كۆماردا بەرەو دیكتاتۆریەت ڕۆیشت. وێڕای هەبوونی چەند سەركردەیەكی كاریزماتیكی وەك مستەفا كەمال بەڵام دیكتاتۆریەتی ئۆلیگارشی بیروكراتی تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە.بەبێ جیاوازیكردن لەنێوان مەیلی ڕاستڕەوی ــ چەپڕەوی و عەلمانی ــ ئایینی ئەو پارتە سیاسی و كۆمەڵە یاسایی و نایاساییانەی لە تەوەرەی دەوڵەتدا ئاواكراون نەیانتوانیوە ڕێگری لە كاریگەرییە دامەزراوەیی و ئایدیۆلۆژیەكانی دیكتاتۆریەتی ئۆلیگارشی بكەن . دادگایی ئەرگەنەكۆن كە لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا هەوڵی بەڕێوەبردنی دەدرێت پەیوەندی بە نەریتی ئۆلیگارشی دیكتاتۆریەتی سەد ساڵەی ناو دەوڵەتەوە هەیە، لەمیانەی ئەنجامەكانیەوە دەتوانین وەك دادگاییەكی گرنگ هەڵسەنگێنرێت كە دەتوانێ چارەنووسی دیموكراتی دیاری بكات.
سەرەڕای ئەوەی دیموكراسی بابەتێكە لە سەردەمی مەشروتیەت تەنانەت لە سەردەمی تەنزیماتیشەوە گفتوگۆی لەسەر دەكرێت، بەڵام وەك تیۆری و دەزگا پەرەی نەسەند. بەتایبەتیش "دیمۆس"ی دیموكراسی گەلی بۆ بنكە شۆڕنەكردۆتەوە. بەڵكو زیاتر بۆ یارییەكی نێوان دوو گروپی هەڵبژێردراوی ئۆلیگارشی وەرچەرخاوە كە پشتیان بە بیروكراسی دەوڵەت و ئەشرافەكانی دەرەوەی شار دەبەست. لەڕاستیشدا هەر شتێك كە پەیوەندیدارە بە بەرژەوەندی خەڵك، لەلایەن هەر دوو گروپە ئۆلیگارشییە هەڵبژاردەكەوە سەركوتكران و پلیشێنراونەتەوە. لەبواری ئابووری، ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی و كلتوورییەوە سیستەم بەشێوەیەكی تۆكمە و داخراو خۆی ڕێكخست و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان درێژەی بە هەبوونی خۆیداوە. بەڵام پەرەسەندنی بونیادی كۆمەڵایەتی و تێكۆشانی گەلان، لە سەردەمی ئاواكردنی ئەو سیستەمە، زیاتریش لە هەلومەرجی ڕۆژی ئەمڕۆماندا بناخەكەی هەژاندووە. كێشەكانی دیموكراتیزەبوون پەیوەست بەم پێشكەوتنانەوە پەرەیسەند. لەبەر كارەكتەری داخراوی ناوخۆیی ڕژێم و ئایدیۆلۆژیا میللیگەرایی، ئایینگەرایی، ڕەگەزگەرایی و زانستگەرا پۆزیتیڤیستەكانی دیكەوە تەنانەت لە كایەی گفتوگۆشدا كێشەكان بە پێناسەیەكی ڕاست نەگەیشتن. یاساكانیش جگە لە ڕێساكانی دەوڵەت، زیاتر بەرەوپێشەوە نەچوو. هەرگیز دەرفەت بە یاساو حقوقی تاك و گەل نەدراوە. ئەو دەستورەش كە دانراوە، نەیتوانیوە خۆی لە ژێر كۆنترۆڵ و كودەتاكان ڕزگار بكات. نە ئازادییەكی شایستەی ڕادەربڕین، نە ئازادی ڕێكخستنبوون هیچیان دانیان پێدانەنراوە. ئازادی ڕادەربڕین لەسەر بنەمای ڕێكەوتنێكی دیاری كۆمەڵایەتی نییە، هەربۆیە نەیتوانیوە خۆی لە هێرشە هەمیشەییەكانی لەناوبردن ڕزگار بكات. كاتێك ئازادییە بنەڕەتیەكانی ڕادەربڕین و ڕێكخستنبوون دانیپێدانەنرا، لەو سۆنگەیەوەش ڕێكەوتنی كۆمەڵایەتی پێویست نەهاتە ئاراوە، ئازادی ڕێكخستن و خۆگوزارشتكردنی گەلان، گروپە ئایینی و چینە ژێردەستەكان پراكتیزە نەكرا كە سەرەكیترین بواری دیموكراتیزەبوونن. سەبارەت بەو بابەتە هەر مافێكی بانگەشەی بوونی دەكرێت، هەر هەنگاوێك كە دەنرێت یان هیچ كاتێك كردەیی نابێت، یاخود لەمیانەی كودەتا و یاسا برۆنزی (هێڵی سوور) یە نووسراو و نەنووسراوەكان بەربەستكراون.
ئەو یاسا برونزییە (هێڵە سوورە) نووسراو و نەنوسراوانە بە توندترین شێوە سەبارەت بە كورد و كوردستانیشەوە بەڕێوەچووە. توندترین یاساكان بەشێوەیەكی بێ بەزەیانە سەبارەت بە ڕاستی كورد و كوردستان پەیڕەوكران. شانبەشانی سزای جەستەیی (قڕكردن ــ كۆمەڵكوژی)، لەمیانەی بەرنامە قووڵ و بەرفراوانەكانی تواندنەوەو سڕینەوە، هەرچیەكی سەبارەت بە كورد و كوردستان لەئارادا بوویێت، یان لەڕێگای لەناوبردن و قەدەخەكردنەوە، یاخود لەپاڵ ئەمانەشدا هەوڵدراوە لە ناو ئایدیۆلۆژیای فەرمیدا بتوێنرێتەوە و لەناو

ببرێت. وەك چەندین گروپی كە لە بەرامبەر ئەم سیاسەت و یاسایانەوە سەریان هەڵدا، كۆمەڵێك مرۆڤ كە لەناو نەریتی چەپگەراییدا خۆیان بە ناوی(PKK) ەوە دەناساند، ئەو بەرخودانەی لە ساڵەكانی (1970)ەوە دەستییان پێكردووە، لەمیانەی قۆناخی جیاوازەوە، سەرباری سەختی و بەخشینی قوربانیەكی زۆر، بە ساڵی (2009) گەیشت. ئەو بەرخودانە لەمیانەی ئەو گۆرانكاریانەی رێگای لە بەردەمیان كردۆتەوە، لە بەرۆژەڤكردنی كێشەكانی دیموكراسی و گەیاندنی بە ئاستی چارەسەری، رۆڵێكی گەورەی گێراوە.
لە ژێر ئەو هەلومەرجانەدا كاتێك لەدەرەوە ئەمریكا و ئەوروپا ئیتر وەك رابردوو ئۆلیگارشی داناسەپێنن، خۆیان لێ دوور دەكەنەوە و بەهۆی ئەو گۆرانكارییانەی بەرژەوەندییەكانیان دەخاتە ژێر مەترسییەوە، كرانەوەیان بۆ چارەسەری دیموكراتی، بۆ جاری یەكەمە لە هەلومەرجی سیاسی توركیا چانسی چارەسەری دیموكراتی برەودەستێنێت. لەم چوارچێوەیەدا پێویستی دەستورێكی مەدەنی كە لەسەر بنەمای رێكەوتنی هەموو بەشەكانی كۆمەڵگا بەدیبێت سەرەكیترین مەرجی چارەسەرییە. دەستورێك لەسەر بنەمای ئازادی و مافەكانی تاك و كۆمەڵگا پێشبخرێت، لە راستیدا ناوەرۆكی دیموكراتی، كۆمەڵایەتی، عەلمانی و مافپەروەری كۆمار كارا دەكات و دەیخاتە ژێر گەرەنتیەوە.
لەم چوارچێوە دەستوورییەدا وەك كێشە كۆمەڵایەتییەكانی تر كێشەی كوردیش دەكەوێتە سەر رێگەی چارەسەری. ئەو كۆمارەی كە بەرگی دەوڵەت ـ نەتەوەی وشك خاو دەكاتەوە، لە ئاكامی بەدەستخستنی مافی تاك و هاوبەشی كوردان، نەك تەنیا لە پارچەبوون رزگاری دەبێت، بەڵكو كاتێك ستوونێكی دیكە قایم دەكرێت كە لە مێژوودا هەر كات رۆڵی فاكتەرێكی دامەزرێنەری بینیوە ئەوا تەندروستتردەبێت و بەمجۆرە بە یەكگرتنێكی دیموكراتی راستەقینە و هەمیشەیی دەگات. لەسەر ئەم بنەمایەش لەو تراژیدیا قورس و زیانە گیانی و مادییە ناكۆتاو ئێشو ئازارو فرمێسكی چاوان رزگاری دەبێت. بەم شێوەیەش ئاسایشی وڵات و خەڵك، گەشەسەندن و بەختەوەری هەمیشەیی دەبێت.

## بەشی دووەم: چوارچێوەی زاراوەیی، تیۆری و پرەنسیپی

لە كاتێكدا لەراستینەی توركیا بۆ دیموكراتیزەبوون و چارەسەری كێشەی كورد هەنگاو بۆ چارەسەری شیمانەكراوو پێناسەكردنێكی ئاشكرای هەندێك لەزاراوەكان دەنرێت پێویستیمان بە روونكردنەوەی ئەگەرە سەرەكیەكان، چوارچێوەی تیۆری و ئەو پرەنسیپانە هەیە كە پێویستە پێیەوە پابەندبین. لەكێشە رۆژانەیی و خولییەكانەوە تا دەگاتە كێشە بونیادیەكانەوە پێویستی بە روونكردنەوەی زاراوەی سەردەمە جیاوازەكانەوە هەیە. ئەگەر شێوازەكانی چارەسەری رۆژانەیی و خولی بونیادەكان لەخۆوە نەگرێت، دەشێت دیسان رێگا لەبەردەم دووبارە دروست بوونەوەی كێشەكان بكاتەوە. بۆ نموونە دەشێت هەندێك كێشە بەرێگای رێبەرنامەو یاساكانەوە چارەسەربكرێن، بەڵام كێشە بونیادیو دەستووریەكان لەمیانەی رێبەرنامەو یاساكان چارەسەر نابن. كێشە بونیادیەكان پەیوەندییان بەسیستەمی دەستورەوە هەیەو پێویستە لەو چوارچێوەیەدا چارەسەر بكرێن.

### أ ـ چوارچێوەی زاراوەیی

لەبەرئەوەی لەرابردوویەكی نزیكدا ناوبردنی كێشەكەش لەتوركیا هەندێك جار قەدەخەكراوە، تەنانەت كێشە لەئاستی زاراوەبوونیشدا دووچاری بنبەستبوون دەبوویەوە. زاراوەی"كورد"و بەرلەویش زۆرێك لەزاراوەكانی ئەدەبیاتی چەپ قەدەخەكرابوون. ئێستاش لەزاراوەی "كوردستان" دەترسن و لایەنە فەرمیەكانیش خۆیان لەبەكارهێنانی دەدزنەوە. لەجیاتی ئەوەی راوەستە لەسەر پێشكەوتنی زانستییانەی زاراوەی كوردستان بكرێت، دەتوانین چەندین بەڵگە بخەینەڕوو كە ئەمە لەچۆنایەتی كارەكتەری خەڵكی هەرێمەكە سەرچاوەدەگرێت، و بەردەوام لەلایەن بەرێوەبەرەكانی سەلجوقی و عوسمانییەوە بە مانای "وڵاتی كوردان" بەكارهاتووە، تەنانەت لە سەردەمی دامەزراندنی كۆماریشدا زاراوەكانی"نوێنەری كوردستان"، "ئەنجومەنی كوردستان"،"ویلایەتی كوردستان" لەلایەن خودی مستەفا كەمال پاشاوە بەكارهێنراوە. قەدەخەكردنی زاراوەكانی كوردو كوردستان لەسەردەمی نكوڵیكردن و ئاسیمیلاسیۆندا حەقیقەت و هەبوونەكەیان لەناو نابات. لەكاتێكدا هەنگاو بەرەو چارەسەركردن دەهاوێژین، قەدەخەكردنی بەكارهێنانی زاراوەكانی كوردو كوردستان لەسەرەتاوە كێشەكە بەرەو بێچارەیی دەبات. هەروەها كاتێك وەك ناو بەكاردەهێنرێت و دۆخی ناپەسەندو چەوتی لێدەكەوێتەوە، شانبەشانی داوەری ئاماژەپێكراو هەندێك لایەن رەدی دەكەنەوە.
دیموكراتیزەبوون لەسەرووی ئەو زاراوانەوە دێت كە پێویستە بە روونی و ئاشكرا پێناسە بكرێت. دیموكراتیزەبوون زاراوەیەكە لەتوركیا دووچاری زیاترین چەواشەكاری هاتووە. بەو مانایەی لەهەڵسەنگەندنەكانمدا بەكاری دێنم دیموكراتیزەبوون بنەماكەی چینایەتی نییە. سەرجەم پێكهاتەكانی كۆمەڵگا دەگرێتەوە. مۆركی هیچ چینێك یان توێژێك هەڵناگرێت. كەمینە بن یان زۆرینە، یاخود سەر بە زمان، ئایین،

ئەتنیك و نەتەوە جیاوازەكان بن، سەرجەم توێژە كۆمەڵایەتیەكان دەتوانن گوزارشت لەهەمان ئازادی خۆگوزارشتكردن، ڕێكخستن و مافەكانی تاك بكەن و لەبەرامبەر دەوڵەتیشدا مافەكانیان گەرەنتی بێت. نە تواندنەوەو بێ كاریگەركردنی دەوڵەت لەناو دیموكراتیداو نە دیموكراتیش لەناو دەوڵەتدا ڕاست نییە. چونكە ڕۆڵ و ئەركی هەردووكیشیان لێكجیاوازە. یەكتری هاوسەنگكردنی دەوڵەت و دیموكراسی یەكێكە لە كێشە ژیانیەكانی دیموكراتیزەبوون.
دوالیزمێكی زاراوەیی دیكەی گرنگ و لەكاتی هەنگاونان بەرەو چارەسەری پێویستی بە ڕوونكردنەوە هەیە "كۆمار و دەوڵەت ـ نەتەوە"یە. هەر كۆمارێك دەوڵەت ـ نەتەوە نییە. بۆ نموونە كۆماری ڕۆما بەمجۆرەبوو. هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەكی خۆی بە كۆمار ناوزەد بكات، ناتوانێت ببێتە كۆمار. زاراوەی كۆمار پەیوەندی بە دیموكراسیەوە هەیەو گوزارشت لەو بەڕێوەبەرێتیەی نوێنەرایەتی دەكات كە گەلیش جێگای خۆی تێدا دەگرێت و لە بژاردەی پاوانخوازی ئۆلیگارشی نائالێن. هەرچی دەوڵەت ـ نەتەوەیە هەروەكو نموونە هەرە بەرچاوەكەی لە ئیتالیای فاشیست و ئەڵمانیای نازی و ژاپۆندا بینرا، پشت بە هاوكێشەی دەوڵەت = میللەت دەبەستێت. گروپە جیاوازەكانی بەرژەوەندی و ماف و ئازادیەكانیان لەناو میللەتدا پەسەند ناكات. دەرفەت بە گروپەكانی ناو دەوڵەت و میللەت نادات ببنە خاوەن بەرژەوەندی ناكۆك و جیاواز. ئەمە لەناوەڕۆكدا دیكتاتۆریەتە. ڕووپۆشی دیموكراسیەتی شكلی ئەو ناوەڕۆكە ناگۆڕێت. لەو سۆنگەیەوە كاتێك لە توركیا بەرەو چارەسەری هەنگاو دەنێین، ڕاست پێناسەكردن و تێگەیشتنی زاراوەكانی كۆمار و دەوڵەت ـ نەتەوە بایەخدارە. بۆ نموونە دەشێت كێشەی كورد لەچوارچێوەی كۆماردا چارەسەر بكرێت، بەڵام ناشێت لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا چارەسەربكرێت كە بەواتای نكوڵیكردن لەكۆمار دەبەخشێت. هەروەها ڕوونكردنەوەی زاراوەكانی "وڵاتی هاوبەش" و "میللەت" یش سەبارەت بە چارەسەربەوە ژیانییە. زۆر ئاساییە كە ئەو گەلانەی خاوەن كلتووری جیاوازن هەمان جوگرافیا بۆ خۆیان وەك وڵاتێكی هاوبەش دەستنیشان بكەن، هەر ئەمەشە كە زۆرجار لەمێژوودا بەرچاومان كەوتووە. بۆ نموونە ئەو جوگرافیایەی جاران بە ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا ناودەبراو ئەمڕۆش بەگشتی وەك توركیاو كوردستان ناو دەبرێت، وڵاتی هاوبەشی زۆرێك لەگەلانی – تورك، كورد، ئەرمەن، ئاشوری، عەرەب، یەهوودی، كریستیان و ڕۆم و زۆرێك لەگروپە بە ڕەچەڵەك قەفقاسیەكانە. تەنیا ناوبردنی بە وڵاتی تورك و كوردان دادپەروەرو ڕاست نییە، كاتێك سنووری توركیا ئەو دەڤەرانەش دەخاتە ناو خۆیەوە بەو مانایە نایەت كە بەتەنیا سەر بە ئەتنیكی توركە.
دەشێت پێناسەیەكی هاوشێوە سەبارەت بە زاراوەی"وڵاتی هاوبەش"یش پێشبخرێت. میللەت بەتەنیا لە یەكە یەكەی هاوڵاتیان پێكنایەت؛ بەڵكو لەوەش گرنگتر پێویستە وەك میللەتی ئەو میللەت و گەلانە دەركی پێبكرێت كە ئەو هاوڵاتیانە ئەندامن تێیدا. ئەگەر سەبارەت بە زاراوەی "وڵاتی هاوبەش" ڕێكەوتن بێتە ئاراوە، ئەو كاتە میللەتی هاوبەشی تەواوی هەموو ئەو گەل و میللەتانەی لەناو ئەو زاراوەیەدان و لەچوارچێوەی سنووری هەمان دەوڵەتدا دەژین، دەبنە میللەتی هەمان دەوڵەت. وەك چۆن دەڵێین كۆماری توركیا، ئەنجوومەنی میللەتی گەورەی توركیا، ئەوا بێژەی میللەتی توركیاش سەبارەت بە دیموكراتیزەبوون دەبێتە زاراوەیەكی چارەسەرئامێز.
ڕوونكردنەوەی زاراوەی"ناسنامە" كۆمەك بە چارەسەری دەكات. ناسنامە گوزارشت لە یەكێك لە كارەكتەرەكانی پێكهاتە ئایینی، میللی، ئەتنیكی، كلتووری، ڕەگەزی و ... هتد كۆمەڵگا دەكات. بەڵام ئەوەی لەبارەی ئەو بابەتەوە گرنگە؛ ئایا ئێمە لەمیانەی چەمكێكی نەرم و كراوە هەڵوێست بەرامبەر ناسنامە پیشاندەدەین، چەمكی ناسنامەی نەرم و كراوە كۆمەكێكی مەزن پێشكەش بە ڕێگەچارەی دیموكراتی دەكات. هەرچی هەڵوێستی داخراو و وشكیشە چارەسەری كێشەكە زۆر سەختتر دەكات. دەشێت پەیوەندی و تێكەڵبوونی ناسنامەكان لەگەڵ یەكتری، وەك دەوڵەمەندییەك سەیر بكرێت. ئەوەی گرنگە مرۆڤ تێبگات، بەكۆتێزێك تواندنەوەی ناسنامەیەك لەناو ئەوەی تردا هەڵوێستی زۆر جیاوازو ناكۆكن.
گرنگترین مەسەلە سەبارەت بەكێشەی زاراوەكان خۆی لەوەدا دەبینێتەوە كە زاراوەكان نەكرێن بە تابۆ؛ چونكە ئەمە مانای پیشاندانی دیاردەیەكی كۆمەڵگایە وەك زاراوەیەكی زێدەڕۆیانەو كردنیەتی بە بەهایەكی شۆڤینی. بۆ نموونە كاتێك یەكێك لە دیاردە كۆمەڵایەتییە ناجێگیرو دەرهەستەكانی لەجۆری وڵات، نەتەوە، ئایین و زمان...هتد. وەك بەهای دۆگماتیكی سەرەكی بسەپێنرێن، لەدژی ڕۆحی چارەسەری دیموكراتیانەیە.

ب ـ چوارچێوە تیۆری "هزری"یەكان

ڕوونكردنەوەی هەندێك چوارچێوەی هزری سەبارەت بەدیموكراتیزەبوون كۆمەك بە چارەسەری دەكات. جیاوازی كردنێكی ڕوون و ئاشكرا لەنێوان هزری دەوڵەت – نەتەوە و نەتەوەی دیموكراتی، فاكتەرێكی هەرە سەرەكییە. دەوڵەت – نەتەوە هەژموونگەرایی هۆمۆژەنی هاوڵاتیبوونی یەك زمان و یەك ئەتنیك بەبنەما دەگرێت. هەروەها ئەو هاوڵاتییە بەهەمان باوەڕی فەرمیەوە دەبەستێتەوە و ناچاری جێبەجێكردنی هەمان سرووتی دەكات. ئەو باوەڕییەی باس دەكرێت وڵاتپارێزی نییە، بەڵكو ناسیونالیزمی شۆڤێنی و ئاینگەراییە. دەوڵەت ــ نەتەوە لەناو پەیوەندی و ناكۆكیەكانیدا جیاوازی و هەمەڕەنگیەكانی كۆمەڵگا پەسەند ناكات، بەڵكو یەكڕەنگی و لێكچوونی

هەر گروپێك لەگەڵا گروپەکانی تر بەبنەما دەگرێت. ئاشکرایە کە ئەو تیۆریەی نەتەوە بەگوێرەی ئایدیۆلۆژیای فاشیزمە. هزرو تیۆری نەتەوەی دیموکرات زۆر جیاوازترە. خاوەن پێناسەی نەتەوەیەکە کە لە تاك و گروپە فرە زمان، ئایین، نەتەوە و کلتوورە جیاوازەکان پێکدێت. لێکچوونی گروپ و هاوڵاتیان بەبنەما ناگرێت. پێناسەی "دەوڵەت = نەتەوە" پەسەند ناکات. لەو پڕوایەدایە کە هەردووکیان دوو پێکهاتەی جیاوازن. دەوڵەت و دیموکراتی دوو بواری جیاوازن کە پێویستە بەهەستیارییەوە راوەستەی لەسەر بکرێت. ئەوەی گرنگە پێویستە ئەو دوو بوارە دان بە رەوابوونی یەکتری دابنێن، هەبوونی خۆیان لەناو هاوسەنگیدا بەدەستبخەن و بیکەنە حوکمێکی بنەڕەتی دەستوور. تیۆری نەتەوەی دیموکرات هێندەی هاوڵاتی، جەماعەت، گروپ و کۆمەڵی مەدەنی بەگرنگی دژمێرێت، لە چوارچێوەی دەستووردا دان بە هەبوونەکەیان دادەنێت. لەو پڕوایەدایە کە زاراوەی هاوڵاتیبوونی "مجرد، ئەبستراکت" زیاتر چەنەبازیەکی لیبڕاڵەکانە، هاوڵاتیبوونیش تەنیا لەمیانەی ئەندامێتی گروپ، جەماعەت یاخود کۆمەڵی مەدەنی مانایەکی بەرجەستە یان کۆنکریتی پەدەستدەخات.
کێشەیەکی دیکەی گرنگی تیۆری سەبارەت بەدەستوورە. پرسیاری" ئایا دەوڵەت یان تاك بەبنەما بگیردرێت"؟ لە بنچینەی هزری دەستوور پێکدێنێت، مەسەلەیەکە گفتوگۆی زۆری لەبارەوە کراوە. جیاوازیەکی زۆر لەنێوان هزری ئەو دەستوورەی کۆی ئەو رێسایانەیە کە دەوڵەت رێکدەخات، لەگەڵا هزری ئەو دەستوورەدا هەیە کە ماف و ئازادیەکانی تاك لەبەرامبەر دەوڵەت رێکدەخات. هەمان شت بۆ ماف و ئازادیە هاوبەشەکان"کۆلەکتیف"ەکانیش لەجێگای خۆیدایە. ئەو تیۆریە دەستوورییەی پێویستە لە هزری دیموکراتیزەبووندا بەبنەما بگیرێ، ئەوەیە کە پشت بە پاراستنی ماف و ئازادییەکانی تاك و کۆمەڵ ببەستێت لەبەرامبەر دەوڵەتدا. دەوڵەت بەو سیفەتەی دەسەڵاتێکە لە بەرزترین ئاستدا خۆی رێکخستووە، پێویستی بە پاراستن نییە. چونکە خۆی لەخۆیدا هەبوونەکەی گوزارە لەپاراستنی دەکات. بەستنەوەی میکانیزم و رێکارەکانی بە رێسا سەرەکیەکانەوە، پێچەوانەی هزری دەستووری دیموکراتی نییە.
خاڵێکی دیکەی گرنگی پێویستە سەبارەت بە تیۆری دیموکراتیزەبوونەوە بە باشی دەرکی پێبکرێت؛ جیاوازییە گرنگەکانی نێوان تیۆری رێگەچارەی دەوڵەتگەرا و رێگەچارەی دیموکراتییانەی کێشەکانی کۆمەڵگایە. هزری دەوڵەتگەرا چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکان لە بەدەوڵەتکردنی هەر شتێکەوە دەبینێت. بۆ نموونە بابەتێکی میتافیزیا و فەلسەفی وەك ئایین کەپەیوەندی بە باوەڕییەوە هەیە دەکرێت بە دەوڵەتی "دەیکاتە موڵکی دەوڵەت"، بەمجۆرەش لەچارەسەرکردن زیاتر دەیکات بە کێشە. هەروەها زۆربەی کێشە ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری و نەتەوەییەکان یان بەدەوڵەت دەکرێن یاخود دەخرێنە ژێر کۆنتڕۆڵی دەوڵەتەوە و بەمجۆرە بانگەشەی چارەسەرکردنیان دەکرێت. ئاشکرایە کە ئەو هزرە کێشەکان چارەسەری ناکات، بەڵکو قورسترو زیاتریان دەکات.
تیۆری رێگەچارەی دیموکراتیانەش کۆمەڵگا بە خاوەنی کێشەکان دەبینێت نەك دەوڵەت، هەربۆیەش لە چارەسەرکردنیاندا کۆمەڵگا بەبنەما دەگرێت. یەکینە پەیوەندیدارەکەی کۆمەڵگا چەندە خۆی بەئاستی رێکخستن و خۆگوزارشتکرنی ئازادانە بگەیەنێت، بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەو رادەیە رێگا لەپێش رێگەچارەی خۆی دەکاتەوە. لەکاتێکدا هزری دەوڵەتگەرا بەردەوام یاسا بەسەر پێکهاتە کۆمەڵایەتییە پەیوەندیدارەکان دادەسەپێنێت، بەڵام هزری دیموکراتی لەو پڕوایەدایە کە دەستپێشخەری خودی کۆمەڵگای پەیوەندیدار گرنگە و خاوەن مافیشە لەدیاریکردن و ئاواکردنی خۆیدا. پەیوەندی لەگەڵا دەوڵەت بەتەواوی رەتکردنەوە یان پێچەوانەکەی نابەخشێت. هەرچەندە لە پەیوەندی و ناکۆکیەکانی نێوانیان گرژیو ئاڵۆزیش بێتە ئاراوە، بەڵام لەچوارچێوەی رێکەوتن و ئاشتیدا پێکەوە ژیانیان بەبنەما دەگرێت. لەو چوارچێوەیەدا چارەسەری دیموکراتی بەئاشتیشەوە پەیوەستە. لەوانەیە هەر ئاشتیەکی کە دێتە ئاراوە لەتەوەرەی رێگەچارەی دیموکراتیدا نەبێت، بەڵام هەر چارەسەریەکی دیموکراتی راستینەی پەرەسەندنی هەر هەبوونێك زامن دەکات کە ئێمە وەك "ئاشتیەکی شەرەفمەندانە" وەسفی دەکەین. ئاشتیەکی ئاپڕومەندانە لەمیانەی دانان بە هەبوون و مافی پێشکەوتنی یەکتری ئەو هێزانە بەدیدێت کەئاشتی لەنێوان خۆیاندا بەرقەرار دەکەن.
مەترسیەکی دیکەی هزری دەوڵەتگەرایی، ئەو هێزانەی لەبەرامبەر خۆشی کە بەکێشەکەوە کاریگەربوونە بەرەو دەوڵەتگەراییەوە ئاراستە دەکات، واتە وەك تاکە رێگای چارەسەری ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆی بەسەردا دەسەپێنێت. بەواتایەکیتر لەبەرامبەر دەوڵەت، بەرەو زهنیەتی دەوڵەتی دەبات. چانسی زۆری چارەسەری هزری دیموکراتی لەوەدایە کە جیابوونەوە لەسنووری دەوڵەت و هەنگاونان بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی تر، ناکات بەپێویستی و ناچارییەك. لەبەرئەوەی دەوڵەت نییە، دەوڵەتیش بۆ خۆی بەئامانج ناگرێت، رەدی ناکاتەوە و نکوڵیشی لێناکات و چارەسەریەکی نەرم پێشبینی دەکات، چانسی مەزنی هزری دیموکراتییانەیە.
کێشەیەکی دیکەی بنەڕەتی هزری، دەربارەی تیۆری مافەکانی تاك و جڤات"کۆلەکتیف"دایە. لەو بارەیەوە گێرەشێوێنیەکی زۆر لە ئارادایە یان پێشخراوە. ئەوە بابەتێکە کە چەمکی تاکڕەوێتی لیبڕاڵی لاڕێی کردووە. تەنانەت تێگەیشتنێکی هەرە کەمی زانستی کۆمەڵناسیش ئەوە رووندەکاتەوە کە تاکەکەس کۆمەڵگاییەو کۆمەڵگاش کەسێتی یان تاکەکەسە، یەکێکیان ئەوەیتر لەخۆوە دەگرێت. چونکە کۆمەڵگا نەبێت تاکەکەسیش هەرگیز ناتوانێت بژی؛ ئەگەر بۆ تەنیا هەفتەیەکیش مرۆڤێك بە تەنیا بهێڵینەوە ئەو راستییە روون دەبێتەوە. هەروەها بۆ تێگەیشتنی ئەو راستییەی کە کۆمەڵگاش لەمیانەی پەیوەندیو هەوڵەکانی تاکەکەسەوە پێکهاتووە پێویستی بە دانابوون نییە، بەڵکو لەمیانەی چەمکێکی هۆشمەندانە بە ئاسانی دەرکی پێدەکرێت. قورسکردنی کێشەکانیش سەرچاوەی خۆی لە رەدکرنەوەی مافی گروپ، جەماعەت و کۆمەڵی مەدەنی وەردەگرێت کە لیبرالیزم بە ئامانجی ئافراندنی نەتەوەی هۆمۆژەن و هاوڵاتی لێکچوو پەیرەوی دەکات. چەندەی

ئازادی و مافی ئەو جڤاتانە"هاوبەشانە" کەمبکرێتەوە، چانسی زۆرترین داگیرکەری و دەسەڵاتداریتی پاوانخوازی سەرمایەو دەوڵەت ـ نەتەوە بەو رادەیە زیاد دەبێت. باسکردنی مافەکانی تاك، بەڵام باسنەکردنی مافی جڤاتەکان و تەنانەت رەتکردنەوەیان پەیوەندی بە هەڵوێستی فاشیستانەوە هەیە. تا دان بە ماف و ئازادی ئەو کۆلەکتیڤایەتی "جڤات" دانەنرێت کە تاکیش ئەندامێتی، ئەوا دانان بە ماف و ئازادی تاك هیچ نرخێکی نییە. هەروەها لەلایەنی تیۆریشەوە ئەوە ئاستەمە. لێرەدا بەتەواوی یاری "عەلی جەنگیز" جێگای باسە. کاتێك دەڵێت" تۆ وەك تاك دەتوانی ئیسلام پەیرەو بکەیت، بەڵام وەك کۆمەڵگا ناتوانیت بژیت" ئەمە هەم دیماگۆژیەتێکی فاشیستانەیە، هەمانکات فێڵبازیشە، بەدەستێك دەیدەیتێو بەدەستەکەیتریش وەریدەگریتەوە. ماف و ئازادییەکانی تاك و جڤات وەك گۆشت و نینۆك یەکتری تەواو دەکەن. بێگومان لەم بارەیەوە رەدکردنەوەی هەرجۆرە جەماعەتپەرستی و جڤاتپەرستیەکی نکۆڵی لەتاك بکات و هەرجۆرە تاکرەوێتیەکیش کە جڤات و کۆمەڵگابوون رەتبکاتەوە، پرەنسیپی هەرە سەرەکی تیۆری ماف و ئازادیەکانی تاك و جڤاتە.
کاتێك لە چارەسەرکردنی کێشەی دیموکراتیزەکردندا چوارچێوەی تیۆری پێشدەخرێت، پێویستە زۆر بە باشی تێبگەین کە کێشەیەکی هەرە گرنگیش، سەرچاوەی خۆی لە زانستی کۆمەڵناسی پۆزیتیڤیست وەردەگرێت کە ناوەندەکەی ئەوروپا بەتایبەتیش فەرەنسایە. لەگەڵ ئەوەی بە ئەزموونی کۆماری پێنجەمیشدا دەرباز بووە، بەڵام زانستی کۆمەڵناسی پۆزیتیڤیست رۆڵێکی دیاریکەری لە کێشەکانی عەلمانیەت، هاوڵاتی و جەماعەت هەیە کە ئێستاش بە دەستیانەوە دەناڵێنێت، لەهەمانکاتدا هۆکاری لەدەستدانی بانگەشەی هەژموونگەرایی سەر ئەوروپاو جیهان بوو بەرامبەر بە بریتانیا. لەبەر ئەوەی کۆماری تورکیا و ئەزموونی تەنزیمات و هەردوو مەشرووتیەتەکانی پێشوتریش، ئەزموونی سێیەمینی کۆماری فەرەنسایان بەبنەما گرت، هەروەها وەك ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتەش پۆزیتیڤیزمیان پەسەندکرد، لێکۆڵینەوەی بەشی ئەمەش لەکێشەکانی دیموکراسی کەئەمڕۆ دەگوزەرێن و روونکردنەوەی ئەنجامەکانیان زۆر گرنگ و بایەخدارە. روون و ئاشکرایە ئەگەر کۆمار لەماوەی "90" ساڵدا لەبواری دیموکراسیدا بەخێرایی کیسەڵیش هەنگاوی نەهاوێشتووە، ئەوا تا کاریگەریەکانی ئەزموونەکانی کۆمارو تیۆری پۆزیتیڤیزمی فەرەنسا لەم لایەنەوە رۆشن نەکرێتەوە، دیسانیش پەرەپێدانی رێگەچارە سەرکەوتووەکان زەحمەت دەبێت و کێشە کۆنەکانیش بەردەوام دەبن. باس لە رەتکردنەوەی هەموو کاریگەریەکانی ئەزموونی پۆزیتیڤیزم و کۆمارگەرایی فەرەنسا ناکەم، بەڵام ئەگەر سوود لەشۆرشە زانستیەکان و پێشکەوتنە مەزنەکانی تیۆری دیموکراسی دوای ساڵانی"1950" وەرنەگرین و کاریگەرییە خراپەکانی تێنەپەڕێنین، ئەوا ناتوانین بە باشی چانسی دیموکراتیزەبوونی مەزن و ئازادی رامان بەکاربێنین.
کاریگەریەکانی فەرەنسا لەلایەنی تیۆری و پراکتیکیدا، بۆ رۆژی ئەمڕۆشمان گرنگیەکی مەزنی هەیە و پێویستە شیکار بکرێت. هەروەکو دەزانرێت زانستی کۆمەڵناسی تەوەرەی ئەوروپا بەشێوەیەکی گشتی لە رۆژی ئەمڕۆماندا رەخنە دەکرێت. چەندەی دەچێت رووپۆشی رۆهەژڵاتناسی سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوین دادەماڵرێت. بەکورتی دەمەوێت بڵێم؛ لەو پروایەدانیم لەمیانەی فەرامۆشکردنی بەها کلتوورییە سەلمێنراوەکانی "15000" هەزار ساڵەی خۆرهەڵاتی ناوین، بەتایبەتیش ئەو بەها کلتووریانەی ماوەی "5000" هەزار ساڵی دوایی پێشەنگایەتی شارستانیەتی ناوەندی کردووەو تواناکانی چارەسەرییان پشتگوێ بخەین، ناتوانین لە رێگای کلتووری مادیگەرایی قەبای پۆزیتیڤیست مانا بە کێشەکانمان و کێشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا بدەین و چارەسەریان بکەین. ئەو چارەسەریانەی لەمیانەی بەبنەماگرتنی ئەو کلتوورە دێنە ئاراوە، لەوانەیە رێگا لەپێش بونیادی نەخۆشتر بکاتەوە. هەنگاوی راست رزگاربوونە لەهەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی تەوەرەی ئەوروپاو بە رۆژەڤکردنی بەها مرۆڤایەتییە شکۆدارەکانی دابونەریتی رۆژهەڵاتی ناوین و رۆژهەڵات و هەڵوێستەکانی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگایە. ئەگەر باسی مۆدێلێکی تورکیا یان رۆژهەڵاتی ناوین بکرێت، زۆر ئاشکرایە کە پێویستە ئەو مۆدێلە سەرچاوەی خۆی لەو راستییە مێژوویی و کۆمەڵایەتییە شکۆدارەوە وەربگرێت.
یەکێك لە ئەنجامە هەرە گرنگەکانی فەلسەفەی پۆزیتیڤیستیش، بەپێچەوانەی بانگەشەکانیەوە، کارەکتەرێکی هەیە کە رێگا لەبەردەم وشکترین شێوەی دۆگماتیزم دەکاتەوە. لەژێر ناوی زانستدا دۆگماتیزمی مۆدێرنیتەی رەوا کردووە، رێگا لەبەردەم فاناتیزم"دەمارگیری"یەکی باوەڕی لەئایین توندتر کردۆتەوە. بۆ نموونە ئەو مانایانەی کە لە زاراوەکانی نەتەوە، وڵات، دەوڵەت، چین و کۆمەڵگاو...هتد بارکراون زۆر لەو مانایە مسۆگەرترە کە لە زاراوەی خودا بارکراوە. بەمجۆرەش ئەو زاراوانە بەشێوەیەکی بەهێزتر لەخوداوەندەوە لەمیانەی پیرۆزی و کارەکتەری ئیلاهییەوە شکۆدار دەکرێن. لەو سۆنگەیەوە هەم ئەو زاراوانە ناوەرۆکی راستەقینەی خۆیان لەدەستدەدەن، هەم دەگشتێنرێن و چوارچێوەی حەقیقەت لەبەین دەبەن. سۆبژەکتیڤیزم لە ئۆبژەکتیڤیزم زیاتر بەرەو دۆگماتیزمی مەترسیدار دەچێت. راستینەی شەڕی"500" ساڵی دوایی جیهان و شەڕەکانی دونیای رۆژی ئەمڕۆمان کە لەزۆر لایەنەوە بە ئاستێك گەیشتووە چیتر بەرگەی ناگیرێت لەنزیکەوە پەیوەندی بەماتریالیزمی پۆزیتیڤیستەوە هەیە.
کاتێك دەڵێن لەدۆگماتیزمی سۆبژێکتیف رزگار ببین، ئەوا دۆگماتیزمی ئۆبژێکتیف هەڵنابژێرین. پێویستە رزگاربوون لە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای رۆژئاوا هەوڵ و کاری لەپێشینەمان بێت. تەنیا ئەوکاتە دەتوانین کێشەکانی کۆمەڵگا و لە هەمووشیان گرنگتر کێشەی دیموکراتیزەبوون، بەگوێرەی سروشتی کۆمەڵگای خۆیەوە بکەینە رۆژەڤ. تەنیا کاتێك دیموکراتیزەبوونی هەمیشەیی، لەناو ئازادی رامان و بەگوێرەی سروشتی

کۆمەڵگاکەیەوە گفتوگۆ بکرێت، چارەسەری خۆی دەدۆزێتەوە. ئەو میراسە کلتوورییەی جەمسەرێکی شکۆدار پێکدێنن لەسەرووی هەمووشیانەوە کلتووری ئیسلامی لەمیانەی زاراوەو تیۆریەکانی تەوەرەی ئەوروپا رۆژانە ناکرێتەوەو شیکاری بۆ ناکرێت. کردارەکانی ئۆریانتالیست "رۆژهەڵاتناسی" کانی ئەو "200" ساڵەی رابردوو، بەپێی پێویست ئەو راستییەی سەلماندووە. هەروەکو چۆن بە تەنیا ناکۆکی عەرەب ـ ئیسرائیل پیشانیدەدات کە چ جۆرە بێچارەییەك لە ئارادایە، ئەوا دەشێت زاراوەکانی عەرەب و ئیسرائیل"زاراوەی نەتەوەی پۆزیتیڤیستە" وەك نموونەکانی ئەو بەڵگاندنە بخەینەڕوو کە هەریەکەیان چۆن بوونەتە میکانیزمێکی بەرهەمهێنانی کێشە، چەندە ماناو راستی لە عەرەبێتی و ئیسرائیل باربکەیت، بەو رادەیە کێشەکە بە بنبەستبوون دەگەیەنێت. لەبەر ئەوەی هەم زاراوەی عەرەب هەم ئیسرائیلیش، ئەو راستییە لەخۆوە ناگرێت کە باسی لێوەدەکرێت، هەربۆیەش گوزارشت لە حەقیقەتەکە ناکات.
دەشێت پەیرەوێکی هاوشێوە سەبارەت بە دەستەواژەی تورك و کوردیش پێشنیار بکرێت. چەندە راستی لە زاراوەکانی تورك و کورد باربکرێت، ئەوا رێگا لەپێش سەختبوونی ئەو کێشانە دەکاتەوە کە لە دەوروبەری ئەو زاراوانەوە پێکهاتوون. لەکاتێکدا دەستەواژەکانی کورد و تورك واقیعێکی سەدەی دوایین کە وەك دیاردەیەکی لاواز هاتوونەتە ئاراوە، لە دۆخێکدا پێویستە لاوازبن، بەڵام بەپێچەوانەوە چونکە بۆ ئاستی حەقیقەتی زلکراو شکۆدارو بەرزکراوەتەوە، رێگایان لەپێش کێشەگەلێك کردۆتەوە کە بەرگەیان ناگیرێت. نەتەوەپەرستی (ناسیۆنالیزم) بەو سیفەتەی ئایینێکی پۆزیتیڤیستە، لە ئایینە نەریتیەکان زیاتر کێشەکانی کۆمەڵگای سەختتر کردووە. بەکورتی بەو رادەیەی هزرو تیۆری دیموکراتیزەبوون لە دۆگماتیزمی سۆبژەکتیف و ئۆبژەکتیف رزگاری ببێت، دەتوانێت کۆمەڵ بە چارەسەری واقیعی بکات.
بابەتێکی تریش کە پێویستە لەچوارچێوەی هزریدا بەدەست بگیردرێت، پەیوەندی نێوان مێژووبیوون و "هەنووکەییبوون" رۆژانەییبووندایە. دۆگماتیزمی سۆبژەکتیف کەئیلهام لەپۆزیتیڤیزمەوە دەگرێت، زۆرترین کاریگەری خۆی لەسەر مانای نێوان مێژوو و هەنووکەدا دیاریدەکات. یان ئەوەتا ئێستا "هەنووکە" وەك کەڵەکەبوونێکی چەندایەتی دەتەرمینیستی وشکی مێژوو پەسەند دەکات، یان ئەوەتا مێژوو بە کەڵەکەبوونێکی چەندایەتی رابردووی تایبەت بە هەنووکە لە قەڵەمدەدات. لەڕاستیدا هیچ جیاوازییەك لەنێوان مێژوو و هەنووکەدا نابینێت. لەو سۆنگەیەوە نکوڵی لە مێژوو دەکرێت. وتەی " ئێستا چیبێت مێژووش ئەوەیە" تۆڕەڵێك چەوتی و هەڵەی زۆر خراپ پێکدێنێت. چونکە بونیادنانی پۆزیتیڤیستانەی هەنووکە لە"90%"ی لەسەر نکوڵیکردنە لە حقیقەت. رەنگدانەوەی لە مێژووشدا یان لەئاستی هەرە ژووردا بەرەو نکوڵیکردن دەچێت یان بەپێچەوانەوە زێدەڕۆیی لەگەڵ خۆیدا دێنێت .
هەڵوێستی راست لەوەدایە؛ لەمیانەی لێکۆڵینەوەیەکی وردەوە دەستنیشان بکرێت کە مێژوو چۆن هەلومەرجەکانی رۆژی ئەمڕۆمان /هەنووکە/ ی دیاریکردووە. هیچ کێشەیەکی کۆمەڵگا دابڕاو لەمێژوو یان بەپێچەوانەکەی تاوتوێ ناکرێت و شیکارنابێت. ناتوانین باسی ئێستایەك بکەین کە رەنگدانەوەی مێژووەکەی نەبێت. چەندە لەمێژوودا گەران بەدوای هەنووکەدا رێبازێکی راست بێت، ئەوا کەمێکیش لەئەمڕۆدا گەڕان بەدوای مێژوودا رێبازێکی راستی بەدواداچوونە. بەڵام ناشێت ئەنجامی"مێژوو = ئێستا" لەمەدا بەدەست بخرێت. مسۆگەرە کە هەلومەرجی یەکتری دیاردەکەن. هەڵوێستی مەترسیدار لەوەدایە پێودانگێکی راست بۆ ئەو خاڵە نەکرێت و هەردووکیان هاوتا بکرێن. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا ملکەچی بۆقەدەر دەکرێت و لەحاڵەتێکی وەهاشدا پێویستی بە تێگەیشتنی کێشە نامێنێت و چانسی چارەسەریش فەراهەم نابێت. بەو مەرجەی لە حەقیقەتە مێژووییەکاندا بەدوای هەلومەرجەکانیدا بگەڕێین دەشێت "ئێستا" وەك دەرفەتێکی ئازادی و چارەسەری ببینین. چەندە بینینی هەلومەرجەکانی کارلێکردنی نێوانیان گرنگ و پێویست بێت، ئەوا بینینی جیاوازیەکانی نێوانیشیان ئەوەندە راستە و کۆمەك پێشکەش بە چارەسەری دەکات.
پێویستە کۆمەکی هەرە دواییش سەبارەت بە رەهەندی هزری لەو تێڕوانین و کردارانە بەدوایدا بگەڕێین کە لەتەوەرەی ئایین و ئەخلاقدان. چارەسەرکردنی دیموکراتیزەبوون بەتەنیا لەچوارچێوەی هزری سیاسیدا نە دادپەروەرانەیەو نە ویژدانیشە. چونکە کۆمەڵگا تەنیا راستینەیەکی سیاسی نییە، بەڵکو راستیەکی ئەخلاقی و ئایینیشە. ئایین و ئەخلاق دامەزراوێکن بە هەزاران ساڵە راوەستەیان لەسەر کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایانە کردووە کە جێگای خۆی تێدا دەگرن وچارەسەرییان بۆ دۆزیونەتەوە. بێگومان فەرامۆشکردنی ئەو دامودەزگا مێژوویی و دەستلێبەرنەدراوانەو پێشنەخستنی ئەنالیز، بەتەنیا لەمیانەی راستینەی ئابووری و سیاسی و چارەسەری ئافراندن، راستیەکی حاشا هەڵنەگرە ناتەواو دەبێت و بۆ هەڵەو کەموکوڕیش کراوە دەبێت. بەمجۆرە لەکاتێکدا هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدرێت. لەلایەکی تر رێگا لەبەردەم سەختکردنی کێشەکان دەکرێتەوە.
یەکێك لەکاریگەرە رووخێنەرەکانی پۆزیتیڤیزم لەسەر کۆمەڵگا، کەمکردنەوەی رۆڵی حەقیقەتی ئایین و ئەخلاقە لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا بۆ نزمترین ئاستەوە. داوەریەکانی ئایین و ئەخلاق، ئەنجامی شیکارو چارەسەریەکانی پێوەری ویژدانی و دادپەروەری پاڵاوتەی ئەزموونە کۆمەڵایەتیەکەی هەزاران ساڵەی کلتووری رۆژهەڵات و رۆژهەڵاتی ناوینە. بەو دۆخەیەوە هانا بۆ بردنی مەرجە. کاتێك ئۆریانتالیزم "رۆژهەڵاتناسی" رێگاچارە باوەکانی رابردوو بێکاریگەر دەکات، فشاری دەسپۆتیزمی لەسەر کۆمەڵگا زیادکردووە، کێشە دیموکراتیەکانی سەختترکردوون. ئەگەر داوەری ویژدان نەبێت، ژیانی کۆمەڵگاش بەردەوام نابێت. تەنیا لەمیانەی هەڵوێستە دەترمینیست، ئیکۆنۆمیست ودەسەڵاتخوازەکانی سەرمایە کە تەنیا بۆ لێکدانەوە

سەهۆڵئاساكان بچوككراوەتەوە تەنیا رێگا لەبەردەم رەوشی گێژاو دەكاتەوە كە سنوورەكانی تێپەڕاندووە، ئەو راستییەی كە دەگوزەرێت بەشێوەیەكی گشتی بەمڕەنگەیە.
لەچارەسەری دیموكراتییانەی كێشەكانی كۆمەڵگادا كە گەیشتۆتە ئاستێكی هەرە مەزن، گەڕانەوە بۆ دادپەروەری و ویژدان، بەهادارەو بژاردەیەكی دەستلێبەرنەدراوە. بۆ نموونە بە ئامانجی دەربازكردنی ئەو تراژیدیانەی گەلانی وەك ئەرمەنی و ئاشووری دووچاری هاتوون، تواناو هێزی ئابووری و سیاسی ـ سەربازیان دەست نادات. تەنیا لەمیانەی گەڕانەوە بۆ داوەرییە عادیل و ویژدانیەكانی ئایین و ئەخلاقی كلتووری ناوچەكەوە دەتوانرێت یارمەتی ئەو گەلانە بدرێت تا ئەو تراژیدیایانە دەرباز بكەن كە لە ئەنجامی كەوتنە تەلەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە تووشی بوون كە بە درێژایی مێژوو لە كلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا جێگای نەبۆتەوە.

ج ـ چوارچێوەی پرەنسیپیەكان:

پێویستە چوارچێوەی پرەنسیپی گرێدراو بە چوارچێوەی هزرییەوە پێشبخرێت. جگە لە رۆژانەیی و كۆنژەكتۆری ئەو رێگەچارە دیموكراتییانەی پێشدەخرێن بونیادییوونیان هەمیشەییبوونیشیان لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پێویستە چارەسەركردنی كێشەكان بۆ رۆژئاواكردن نەبێت، بەڵكو یان خزمەت بەرزگاركردنی سیستەم بكات، یان بۆ سەرلەنوێ ئاواكردنەوە بێت. دەوڵەتی كارگوزاری و سەقامگیری هەمیشەیی كۆمەڵگا ئەمجۆرە چارەسەرییانە دەكەن بە پێویستییەك. بەگوێرەی ئەوەی دیموكراسی سیستەمێكی كۆمەڵگا و دەوڵەتە، پێویستە هەنگاوەكانی دیموكراتیزەبوونیش سیستەماتیك بێت. ئەو پرەنسیپانەی دەتوانین زیاتریشی پێشبخەین و رێزبەندیان دەكەم، لەو پروایەدام كە كەمترین مەرجەكانی چوارچێوەیەكی هەمیشەیی سیستەمی دیموكراتی پێكدێنن.

1ـ پرەنسیپی نەتەوەی دیموكرات:

نەتەوەبوون كە بەدیهێنەری یەكبوون و یەكپارچەییە لەجیاتی دەوڵەت ـ نەتەوە پێویستە وەك نەتەوەی دیموكرات ئاوابكرێت یان ئەو نەتەوانەی هەن وەرچەرخان بەرەو نەتەوەی دیموكراتی بكەنە ئامانجی خۆیان. دەشێت چەمكی نەتەوەی نەرم و ناسنامەی كراوە سەرەتایەكی باشی ئەو ئامانجە بێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەو نەتەوەیەی چوارچێوەی یەكگرتن پێكدێنێت لەمیانەی فشارو توندوتیژی دەسەڵاتەوە ئاوا نەكرێت، بەڵكو لەسەر بنەمای ئارەزوومەندی دیموكراتی یان لەرێگای وەرچەرخانەوە پێكبهێنرێت. لە نەتەوەی دیموكراتیدا ماف و ئازادیەكانی تاك و هاوبەش"كۆلەكتیف"، وەك دوو رووی مەدالیایەك یەكتری تەواودەكەن. تەنیا هاوڵاتی لەخۆوە ناگرێت، بەڵكو بەسیفەتی یەكینەی كۆلەكتیف گروپە جیاوازەكانی كۆمەڵگای مەدەنی، جەماعەت و گەلانیش وەك سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی دەبینێت. هەرچەندە هاوڵاتییان ببنە فاكتەری جڤاتێكی كاراو كاریگەر، بەو ئەندازەیە پێگەیەكی بەهێز بەدەست دێنن.

2ـ پرەنسیپی نیشتیمانی هاوبەش "وڵاتی دیموكراتیك:"

پێویستە چەمكی وڵاتی هاوبەش "وڵاتی دیموكراتی" بەبنەما بگیردرێت. واتە لەجیاتی وڵاتی تاكە ئەتنیك و تاكە زمانێك، واقیعیترین چەمكی وڵات ئەوەیانە كە لەهاوڵاتیانی فرە زمان، فرە نەتەو و فرە ئایین پێكدێت. بەمجۆرەش زیاتر پێشوازی لە یەكگرتن و برایەتی دەكات و لەناو كەشوهەواكەیدا دەژیت. چەمكی وڵاتێك كە تەنیا هەستی موڵكایەتی ئەتنیكێك دەخاتەروو زۆربەی زۆری هاوڵاتیان دەكات بە ئەویتر. ئەم ئەویتربوونەش پەرە بە جەمسەرگەرایی دەدات و لەبنەڕەتدا چەمكێكە رۆڵی جوداخوازی دەبینێت. ئاشكرایە كە چەمكی هاوڵاتیبوونی لەهەمان تۆڕنە دەركەوتوون، سەرچاوەی خۆی لەفاشیزمەوە دەگرێت. هەمەڕەنگی گوزارشت لە دەوڵەمەندی سروشت و كۆمەڵگا دەكات. پێویستە هەستی وڵاتپارێزی بەشێوەی پابەندبوون بەخاك، ژینگەپارێزی و پێشكەوتن بەرجەستە بكرێت نەك بەشێوەی شۆفینیزم و نەژادپەرستی.

3ـ پرەنسیپی كۆماری دیموكراتی:

شرۆڤەکردنی شێوەی دەوڵەتی کۆمار بە دەوڵەت ـ نەتەوە، بە تایبەتیش دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی وشك فاکتەرێکی دیکەی ئەویترکردنە. باشترین سیستەمی دەوڵەت بۆ کۆمار دەوڵەت ـ نەتەوە نییە، بەڵکو دەوڵەتی دیموکراتییە. ناشێت دەوڵەتێك هەم دەوڵەت ـ نەتەوە پێت هەم دەوڵەتێکی دیموکراتی. چونکە ئەو دوو سیفەتە لەگەڵ یەکتردا ناکۆکن. دەوڵەتی دیموکراتی ئەو دەوڵەتەیە کە بۆ سیستەمی دیموکراتی کراوەیە و لەگەڵیدا رێك دەکەوێت. دەوڵەت ـ نەتەوە ئامانجێکی بەو شێوەیەی نییە، بەپێچەوانەوە کۆمەڵگای دیموکراتی لەناو خۆیدا دەتوێنێتەوە. پرەنسیپی رێگەچارەی دیموکراتی لەگەڵا کۆماردا دەگونجێت، بەڵام ناتوانێت هەمان رێکەوتن لەگەڵا دەوڵەت ـ نەتەوە ئەنجامبدات. ئەوەی گرنگە کۆمار وەك رێکخستنێکی چەترئاسای دیموکراتیزەبوون ببینرێت و لەو چوارچێوەیەدا ئاوابکرێت. بە ئایدیۆلۆژی نەکردنی شێوازی دەوڵەت یان کۆمار، هەروەها گرێنەدانی بەئەتنیکێك یان ئایینێکەوە بۆ رێگەچارەی دیموکراتی گرنگە. پێشخستنی پێناسەیەکی حقوقی بۆ کۆمارو دانانی بە رێکخستنێکی چەتر ئاسای دیموکراتییانەی سەرجەم هاوڵاتیان لەجێی خۆیدایە. واتە پێناسەکردنی کۆمار وەك رێکخستنێکی حقوقی دیموکراتییانەی سەرجەم هاوڵاتیان زۆرگرنگە. بەم رەنگە بەشێوەیەکی گەوهەری پێناسەکە پرەنسیپی کۆمەڵایەتی و پرەنسیپی عەلمانیەتیش لەخۆوە دەگرێت. تەنیا کاتێك بەمجۆرە بە روون و ئاشکرایی کۆمار پێناسە دەکەین بە ئەتنیکێك، ئایدیۆلۆژیایەك یان ئایینێکەوە نایبەستینەوە. بۆ نموونە بەبێ پێوەلکاندنی دەستەواژەکانی تورك و کورد کە گوزارە لە نەژادو ئەتنیك دەکەن و سیفەتە ئایدیۆلۆژیەکانی دیکەی وەك ئیسلامیەت، مەسیحیەت و سونیبوون، ئەوا گوزارشتی کۆمار فراوان و یەکگرتوو دەبێت.

4ـ پرەنسیپی دەستووری دیموکراتی:

لەگەڵا ئەوەی دیموکراتیزەبوون بزووتنەوەیەکی سیاسییە، بەڵام تا ئەوکاتەی بەدەستورێکەوە پابەند نەکرێت کە لەمیانەی رێکەوتنێکی کۆمەڵگاوە سازکراوە، نابێت بە رژێمێکی بەڕێوەبەرایەتي سیستەماتیك و هەمیشەیی. دەستووری دیموکراتیش، گوزارشت لەرێکەوتنی کۆمەڵگای دیموکراتی و دەوڵەت دەکات. ماف و ئازادیەکانی تاکیش، تەنیا لەمیانەی کۆمەڵگای دیموکراتیەوە مانادار دەبێت. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ناتوانرێت پاراستنی ئەو مافانە بکرێت لەبەرامبەر دەوڵەتدا کە بریتییە لە چڕبوونەوەی هێزێکی زەبەلاح. بۆ ئەوەی دەوڵەتیش وەك دامەزراوێك نەبێت کە بەردەوام سەرچاوەی کێشە و ئاستەمکردنیان بێت، بەڵکو ببێتە بوارێکی کەڵەکەکردنێکی ئەزموون و شارەزایی دەستووری دیموکراتیك ئامرازێکی دەستلێبەرنەدراوە. دەستووری دیموکراتی بەو کارەکتەرەی کە دەوڵەت کارا دەکات و لەدۆخی کەڵەکەکردنی شارەزایی و ئەزموونیدا دەهێڵێتەوە رۆڵی ئەو کەتیرەیە دەبینێت کە کۆمەڵگاو دەوڵەت بەیەکەوە دەبەستێتەوە.

5ـ پرەنسیپی چارەسەری دیموکراتی:

پرەنسیپی چارەسەری دیموکراتی، مۆدێلێکی چارەسەرییە کە دەوڵەتبوون ناکاتە ئامانج، پاشکۆی دەوڵەتیش نییە، بەڵکو دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی واتە کۆمەڵگای دیموکراتی بەبنەما دەگرێت. لەجیاتی ئەوەی لەبونیادی دەوڵەتدا هەوڵی گۆڕانکاری شێوە سەرەکیەکەی بدات، روو لەو رێگەچارانە دەکات کە لە بونیادی کۆمەڵگادا بەدوای سیستەمێکی دیموکراتیدا دەگەڕێت. سەبارەت بەدەوڵەتیش تەنیا داوای دەستوورێکی دیموکراتی لێدەکات. هەڵبەتە بۆ نووسینی دەستوورێکی دیموکراتی پێویستە هەوڵە پراکتیکی و تیۆریەکان دڵنیاکەربن، ئەو دەستوورەش لەدەوڵەت زیاتر، پێویستە دڵخۆشی و ئاسوودەیی کۆمەڵگا بەبنەما بگرێت. داسەپاندنەکانی رێگەچارەی دەسەڵاتگەرێتي ـ دەوڵەتگەرێتی لەدژی پرەنسیپی چارەسەری دیموکراتییە. وەك پرەنسیپ چارەسەری دیموکراتی سەرقاڵی بەشینەوەی دەسەڵات نابێت، تەنانەت لەدووری دەسەڵات دەوەستێت. چونکە چەندەی دەسەڵات قاڵبێتەوە دووری دیموکراسی دەکەوێتەوە. ئەگەر تەنیا بەناوی حکومەت و دەوڵەتەکانەوە کۆمەڵگاکان رێکبخرێن، ئەو سیستەمەی دێتە ئاراوە دژە دیموکراسی دەبێت. چونکە هێزە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگا نەخراونەتە ناو ئەو کارەوە. ئەگەر ئەرکپێدانی کاربەدەستانی دەسەڵات و حکومەت بەلایەنی ئەرێنیەوە بێت، لەوانەیە رێگا لەبەردەم دیموکراتیزەبووندا بکاتەوە، بەڵام خودی دیموکراتیزەبوون فەراهەم ناکات. ناشێت ئامانجەکاني چارەسەری دیموکراتیش، دابەشکردنی توانستەکانی دەسەڵات یان دەوڵەت بێت. ناشێت خۆ بە دەوڵەتەوەگرتن و پێکهێنانی جەمسەرێکی دەوڵەت ئامانجی رێگەچارەی دیموکراتی بێت.
خاڵی سەرەکی پرەنسیپی چارەسەری دیموکراتی، لەوەدایە کە بەیەکەوەژیانی ئاشتیانەی دەزگاکانی دیموکراتی و دەزگاکانی دەوڵەت دەخاتە ژێر گەرەنتی دەستووریەوە. رەوابوونێکی یاسایی لەنێوان بوونی هەردوو دەزگادا جێگای باسە. هەبوونی خۆیان بەنکوڵیکردن لەیەکتری نابەستنەوە. نە بەناوی دیموکراسیەوە پێویستی بە لەناوبردنی دەوڵەت هەیە، نە بەناوی دەوڵەتیشەوە پێویستی بە توانەوەی دیموکراسی هەیە. ئەو

بەناویەکداچوونە زێدەڕۆییەی لەسیستەمی رۆژئاوا لە ئارادایە رێگا لەپێش ئەوە دەکاتەوە کە لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا دیموکراسی بۆ دامەزراوێکی رووکەشی بگۆڕێت. کێشەی هەرە رۆژانەیی دیموکراتیزەبوون، سەرلەنوێ رێکخستنەوەی پێکەوە ژیانی ئەودوو دامەزراوەیە بە مەرجێك تێکەڵبوونەکەیان دەرباز بکات. وەك چۆن سنووردارکردنی دەوڵەت لەلایەن دیموکراسیەوە پرەنسیپێکی دەستلێبەرنەدراوە، دەوڵەتیش وەك هێزێکی بەئەزموون و شارەزا، رۆڵی چەترێکی دیموکراسی ببینێت پرەنسیپە. ئەوەی لەناو پرۆسەیەکی مێژووییدا دێت و بەسەرکەوتوویی دەردەکەوێت، کۆمەڵگای دیموکراتییە. بەکورتی راوەستەی گرژی دامودەزگاکانی دەوڵەت و دامەزراوە دیموکراسیەکان لەناو ئاشتیدا، گوزارشت لە دۆخێکی کێبرکێ دەکاتەوە، ئەوەی لەو رەوشەدا بەهێز دەبێت خودی کۆمەڵگای دیموکراتییە.

6ـ پرەنسیپی پێکەوەبوونی ماف و ئازادیەکانی تاك و کۆلەکتیف"جڤات:"

دەشێت لە ئەزموونە لەژمارنەهاتووەکانی دونیاوە تێبگەین کە لە جێبەجێکردنی پرەنسیپی ماف و ئازادیەکاندا کە رۆڵێکی ژیانی لە چارەسەرکردنی کێشەکانی دیموکراتیزەبووندا دەبینێت لێکجیاکردنەوەی ماف و ئازادیەکانی تاك و جڤات لە چارەسەرکردن زیاتر کێشەکان سەختتر دەکات و بە بنبەستبوونی دەگەیەنێت. هەروەها ئەو جیاکردنەوەیە لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگاکاندا ناکۆکە. لەهیچ کات و سەردەمێکی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا خاوەن ماف بێت یان بێ ماف، ئازاد بوویێت یان ژێردەست، تاك بەبێ جڤات نەژیاوە. لەبنەڕەتدا خودی تایبەتمەندی مرۆڤ ئەوەیە کە ئاژەڵێکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووە. لەو سۆنگەیەوە هەر ماف و ئازادیەك کە تاك بەدەستی هێناوە یان ژیانداری کردووە، تا لەگەڵ ئەو جڤاتانەی ئەندامن تێیدا هاوبەشێتی نەکات، هیچ مانایەکی نابێت. ئەو تاکەی لە کۆمەڵگا دابڕێنراوو دەرهەستکراوە چەندە بێمانا بێت، ماف و ئازادییە بەدەستخراوەکانیشی بەو رادەیە بێ مانان و توانای جێبەجێکردیان نییە. پێچەوانەکەشی راستە: ئەو ماف و ئازادیانەی بۆ جڤاتێك دانیان پێدانراوە ئەگەر بۆ تاکەکانی سەربەخۆی دانی پێدانەنرێت، هیچ بەهاو مانایەکی نابێت. ماف و ئازادییەکان بەبێ تاك ژیانداری ناکرێت. وەك چۆن بێبەشکردنی تاك لەماف و ئازادیەکان، لەمیانەی تێخزاندنی کۆمەڵگاکەیان بۆ هەمان دۆخەوە بەدیدێت، بێبەشکردنی کۆمەڵگاو جڤاتەکانیش لە ماف و ئازادیەکانی، مانای تووشکردنی تاکەکانی ئەندامی کۆمەڵگاکانە بە هەمان رەوشەوە. بەکورتی ماف و ئازادییەکان بەهایەکن نە بەبێ تاك و نە بەبێ کۆمەڵگا نابێت، تا هەردووکیان بە یەکەوە نەبن و هاوبەشێتی لەو بەهایانەدا نەکەن ژیاندار نابن.

7ـ پرەنسیپی سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و ئازادی:

تێگەیشتنی ئەو راستییە لەبنەمای ئەو پرەنسیپەدا شاراوەیە؛ تا لە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی رزگار نەبیت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە ئاستی جیهان باڵادەستی کردووە و هەڵگری چۆنایەتی ماتریالیستی قەبەیە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئایدیالیستەو خۆی وەك "زانستگەرایی پۆزیتیڤیست" دەناسێنێت، ئەوا دیموکراتیزەبوون و ئەو ئازادییەی ناواخنی بەدینایەت. زانستگەرایی پۆزیتیڤیست پرەنسیپی سەرەکی شارستانی هەژموونگەرایی ئەوروپایە. تا هەژموونی ئەو پرەنسیپە باڵادەست نەکات، ئەوا ناتوانێت فاکتەرە سەرەکیەکانی دیکەی وەك سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە لەهەموو جیهاندا، پابەند بەخۆی بونیاد بنێت و بەڕێوەیببات. باڵادەستی ئایدیۆلۆژی لە رۆژهەڵاتی ناوین، لەمیانەی زانستی رۆژهەڵاتناسیەوە زهنیەتەکان فەتح دەکات. دوای ئەمەش یاخود لەگەڵیدا، لەمیانەی فاکتەرە سەرەکیەکانی دیکەوە فەتحکردن، چەوسانەوە و داگیرکەری بەشێوەی زۆر جیاواز ئەنجامدەدرێن. داگیرکەری نوێش وەك پێویستیەکی سروشتەکەی بەردەوام لەگەڵ فاکتەرە خۆجێییە دەستپۆتە "سەرکوتکەر" کۆنەپەرستەکان لەناو هاوکاریدایە، کێشەکانی دیموکراتیزەبوون سەختگیرتر دەکات. هەرجۆرە بەرخودانێك کە لە بەرامبەریدا پێشدەکەوێت، لایەنێکی دیموکراسی لەخۆوە دەگرێت. بۆ ئەوەی ئەو لایەنە دیموکراتییە پێشبکەوێ و بەهێزببێت، لەسەر پێی خۆی بوەستێت و بەو شێوانە بگات کەخۆی سیستەماتیزە بکات، پێویستە لە ئایدیۆلۆژیای هەژموونگەرایی دابڕێت. بۆ ئەوەی بژارەکانی ئایدیۆلۆژیای ئەلتەرناتیف ماناداربن، پێویستە زۆرێك لە کاتەگۆریە هەرێمی، شارو خۆجێییەکانی فرەنەتەوەو وڵاتی هاوبەش لەخۆوە بگرێت. لە دۆخێکی پێچەوانەدا، لەوانەیە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیایەکی تر پێشبکەوێت.
بۆچوونە نەژادپەرست و ئایینگەرا باوەکانیش بەلای کەمەوە ئەوەندەی هەژموونگەرایی پۆزیتیڤیست کە ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە، ئەوانیش هەژموونگەران. لەریزبەندی سەرەکی دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیای ئامانجپێکراودا دەرکەوتنی ئەو ئایدیۆلۆژیانەی پشت بە ئازادیخوازی دەبەستن دەشێت وەك

ئایدیۆلۆژیای ئازادی هەڵسەنگێنرێن. تەنیا لەمیانەی ئەو ئایدیۆلۆژیانەی ئازادییەوە دەشێت کێشەکانی دیموکراتیزەبوون و رێگاکانی چارەسەری روون بکرێنەوەو جێبەجێ بکرێن. ئازادی ئایدیۆلۆژی نەبێت، هەر کاتێك دەتوانرێت هەنگاوەکانی دیموکراتی ئاستەنگ بکرێن، بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئایدیۆلۆژیا هەژموونگەراکانەوە. ئازادی ئایدیۆلۆژی گرێدراوی حەقیقەتی سروشتی کۆمەڵگایەو کاتێك کۆمەڵگای دیموکراتیش بونیاد دەنرێت و ژیاندار دەبێت بەشێوەیەکی بەردەوام گوزارشت لەخۆی دەکات. حەقیقەتی کۆمەڵگا گوزارشتی ئازادانەی راستیەکانی کۆمەڵگای دیموکراتییە.

8ـ پرەنسیپی مێژووییبوون و هەنووکەییبوون:

کێشەکانی دیموکراسیەت و ئەگەرەکانی چارەسەری، لەنزیکەوە پابەندی دانانی پەیوەندیەکی راستی نێوان مێژووییبوون و هەنووکەییبوونە. زهنیەتێك کە کێشە پەیوەندیدارو ئەگەرەکانی چارەسەری لە مێژوودا فەرامۆشو سانسۆر کردووە، نەك تەنیا کێشەکانی دیموکراتیزەبوون، بەڵکو تێگەیشتنی تەواوی کێشە کۆمەڵایەتیەکان لەولاوە بمێنێت، سەختتریان دەکات و بە دۆخی بنبەستبوونیان دەگەیەنێت، بێگومان گۆرانی ئەو رەوشەش بۆ قەیران، پێکهەڵپژان و شەڕ دەستلێبەرنەدراوە. بوویەرو رووداوەکانی مێژوو سەرەکیترین مەرجەکانی دیاریکەری هەنووکەو ئەمڕۆن. ئێستا یان رۆژانەیی، بریتییە لە دۆخی خۆپێشکەشکردنی مێژوو بە هەموو کێشەو ئەگەرەکانی چارەسەریەوە. تاکە جیاوازی ئەوەیە: ناتوانین دەست لەرابردوو وەربدەین ، بەڵام دەتوانین دەست لەئێستا، یان رۆژانەیی وەربدەین. گرێدراو بەبنەمای فیکری و هێزی مادی دەستێوەردانەکان، دەتوانین هەنووکە یان رۆژانە بگۆڕین. دەتوانین گۆرانکاری خێراتر بکەین، یان ئاراستەکەی بگۆڕین، ئازادی بکەین یاخود زیاتر بەکۆیلەی بکەین. ئەمە مەسەلەیەکە بەتەواوی گرێدراوی پێگەی هێزەکانی دەستتێوەردانەوەیە. ئەوەی گرنگە چۆنیەتی وەڵامدانەوەی پرسیاری "ئایا پێویستە رابردوو، مێژوو لەمیانەی ئەڵقە بنەڕەتیەکانیەوە چۆن لەئێستادا رەنگبداتەوە؟". بەتایبەتی کاتێك هەنووکە وەك گوزارشتی بوارە پەیوەندیدارەکانی مێژوو شیکار دەکرێت کە پێیەوە سەرقاڵین، ئەوا کلیلی چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگایە. ئەگەر لەو چوارچێوەیەدا دەرك بە مێژوو بکرێت، ئەوا دەبێتە گەورەترین سەرچاوەی هێزمان. ئەوانەی لەمێژووی خۆیان تێناگەن و ناتوانن بینووسن، ئەگەرێکی لاوازە بەراستی لەئێستا تێبگەن و بتوانن ئازاد و دیموکراتیزەی بکەن. ئەو ئازادی و دیموکراسیانەی بە پەلەپروزێ بونیاد دەنرێن هەمیشەیی نابن؛ چۆنی بەدەست هێناون، لەوانەیە بەوجۆرەش لەدەست بچێت. پێویستە باش بزانرێت کە خودی کۆمەڵگا پێشکەوتووترین مێژووە. ئەگەر کۆمەڵگا بەو رووەی، واتە لەمیانەی ئەو حەقیقەتەوە نەناسرێت کە بۆخۆی مێژوویکە، ئەوا زەحمەتە لە کێشەکان رزگاری بێت و بە رێگەچارەو شێوازی ژیانی دیموکراتییانە بگەیەنرێت. هەربۆیەش یەکەمین کاری زۆردارەکان، لەناوبردنی یادەوەری کۆمەڵگایە. یەکەمین کاری کە پێویستە دیموکراسیخوازەکان بیکەن خاوەندارێتیکردنی یادەوەری کۆمەڵگایە، واتە خاوەنداریکردنی راستیەکانی مێژووە. گەورەترین خراپەکاری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەوەدایە؛ زەبری کوشندەی لەیادەوەری مرۆڤایەتیداوە، هەنووکەشی وەك ئەبەدی و کۆتایی مێژوو پێشکەشکردووە. بەگوێرەی ئەوەش هەموو شتێك بریتییە لە هەنووکەی قەتیسکراو. ئەو نەخۆشییەی بە تاکگەرایی یان تاکخوازی ناودەبرێت گرێدراوی ئەو چەمکەیە. تاکگەرایی" بۆخۆت بژی، ئەویتر پووچە" پەیوەندی بەنکوڵیکردنی کۆمەڵگای مێژووییەوە هەیە. ناشێت حەقیقەتی کۆمەڵگاو گوزارشتەکەی واتە کۆمەڵگای دیموکراتی لە زهنیەتێکی بەمجۆرە چاوەڕوان بکرێت. هەربۆیەش تاکخوازی لەو لایەنەوە تاکڕەویەتی لیبراڵا نکوڵیکردنی دیموکراسییە. بینینی سات لە مێژووداو مێژووش لە ساتدا پرەنسیپی راستی زانستی کۆمەڵناسییە.

9ـ پرەنسیپی ئەخلاق و ویژدان:

سۆسیۆلۆژیای رۆژئاوا ویژدان ناناسێت. بەشێوەی ژێری ئەنالیتیك دەستبەکارە. ویژان پێویستی بە ژێری سۆزداری هەیە. سۆسیۆلۆژیای مۆدێرن کە بەشێوەی فەلسەفەی ئەنالیتیك دەستیپێکردووە، لەرۆژی ئەمڕۆماندا بۆ بەڕێوەبەرایەتیەکی تەکنیکی گۆڕاوە. کەچی لەراستیشدا ویژدان لەسەرووی ئەو پرەنسیپانەوە دێت کە بونیادی کۆمەڵگای ئافراندووە. ویژدان وەك دادوەریەکی دادپەروەرانەی کۆمەڵگا رۆڵ دەبینێت. کاتێك بەهیچ دانانرێت و حیسابی بۆ ناکرێت، کۆمەڵگا وەك ئامێرێکی دڕندەی زۆر مەترسیدار دەستبەکار دەبێت. دەشێت ویژدان وەك ناوەڕۆکی ئایین و ئەخلاقیش بژمێردرێت. ئەگەر بەسیفەتی دابونەریتێکی وشك ئایین و ئەخلاق لەلایەك دابنێین، ئەوەی لەو دوو دامەزراوەدا دەمێنێتەوە، ویژدانی کۆمەڵگایە. ویژدانی کۆمەڵگا ئەو تاکە شوێن و بوارەیە کە ئەوانەی هێزی سیاسی، ئابووری و سەربازییان نییە پەنای بۆ دەبەن. کاتێك ئەو گۆڕەپانە تێکبدرێت، تەنیا پرەنسیپی هێز لەکۆمەڵگادا دەستبەکار دەبێت، ئەوکاتیش هەرکەسەو دەبێتە گورگی یەکتر.

دیموکراسی رژێمێکی وایە کەناکرێت بێ ویژدان بەڕێوەبچێت. سیستەمەکانی سەرمایەداری و هێزە قۆرخکارەکان، لەسەر نکوڵیکردن لە ویژدان ئاواکراون. لەناوەڕۆکدا دەشێت دیموکراتیزەبوون وەك بزووتنەوەی پووچەڵکردنەوەی نکوڵیکردنی ویژدان و وەدەستخستنی ویژدانی کۆمەڵگاش پێناسەبکرێت. کۆمەڵگا زەبەلاحەکەی لەدەرەوەی پاوانی هێز و سەرمایەدا دەمێنێت، تەنیا لەمیانەی بزاوتی ویژدانەوە دەپارێزرێت. لەرۆژگاری ئەمڕۆدا تێکۆشانی کۆمەڵگا، بە مانایەك لەماناکان بەدەستخستنەوەی ئەو ویژدانە ونکراوەیە. تا دیموکراتیزەبوون نەبێتە جولانەوەی بەدەستخستنی بەها ویژدانییە ونکراوەکان، بەمانای راستی خۆی ناگات، تاك و کەمەنەتەوەکان ناتوانن ماف و ئازادیەکانیان بەدەستبخەن. تەواوی ئەم بیانوانە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دیموکراتیزەبوون مسۆگەر دەستبەکاربوونی دەکەنە پێویستیەك کە بەهای پاڵاوتەی ئایینی و ئەخلاقی کۆمەڵگان .
تا ویژدان دەستبەکار نەبێت راستینەی کۆمەڵکوژی چارەسەرنابێت. تەنیا کاتێك پرەنسیپی ویژدان کەوتە جموجۆڵ و دەستبەکاربوو سەرجەم تاوان و کۆمەڵکوژیەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دانیان پێدادەنرێت و رێگا لەبەردەم دادپەروەری دەکاتەوە. مۆدێرنیتە لەهەموو کێشەکانی کۆمەڵگادا پرەنسیپی هێز بەبنەما دەگرێت. ئەوەی خاوەن هێزە سەردەکەوێت یانیش کێشەکان چارەسەردەکات، ئەوەی بێهێزە ژێردەکەوێت و راستیەکەی لەناودەچێت. ئەمەش گەورەترین نەخۆشی بناخەی مۆدێرنیتەیە. لەمیانەی ئەو پرەنسیپەوە کۆمەڵگا بۆ دارستانێك دەگۆڕێت کە لەچاخی بەردین خراپترە. ئەگەر دەمانەوێت وەڵامی هەمیشەیی و دادوەرانە بۆ کێشەکانی کۆمەڵگا بدۆزینەوە، لەسەررووی هەمووشیانەوە وەڵامی ئەم کێشەی دیموکراتیزەبوون بدەینەوە ، مسۆگەر پێویستە لەجیاتی پرەنسیپی هێز، جێگا بە پرەنسیپی ویژدان بدەین. کلتووری رۆژهەڵاتیش بەو پرەنسیپە نامۆ نییە. بەپێچەوانەوە لەهەموو کێشەکانیدا رۆڵی سەرەکی بەم پرەنسیپە داوە. ناشێت بەهۆی حیساب و لێکدانەوە بەستەڵەکەکانی سەرمایەداری دەستبەرداری ئەو پرەنسیپە بکرێت. کاتێك چارەسەری بۆ کێشەکانی دیموکراتیزەبوونی تورکیا دەئافرێنین، پێویستە پرەنسیپی ویژدانی لەسەررووی هەموو پرەنسیپەکانەوە جێگیر بکەین و پەیرەوی بکەین.

10ـ پرەنسیپی بەرگری خۆیی دیموکراسییەکان:

حەقیقەتێکی زانراوەو بەشێوەیەکی زانستی سەلمێنراوە لە بوونەوەری تاکخانەکانەوە تا دەگاتە ژیانی تەنۆلکەکانی وردتر لە ئەتۆم کە مەزەندەی بێروحییان دەکرێت بەڵام راست نییە، بەڵکو بناخەی سەرجەم بوونەوەرەکانە، هیچ بوونێك لە ئارادانییە بەرگری خۆیی نەبێت. لەهەر شوێن و ساتێکی ژیاندا بە دڵنیایی ئەو خاڵە رەچاو دەکرێت کە بوونێکی خاوەن ئاستێکی بەرزی نەرمایی و ژیری وەك کۆمەڵگای مرۆڤ بێ بەرگری خۆیی نابێت. تەنانەت شەڕەکانیش لەنزیکەوە پەیوەستی چەمکی شێوێنراوی بەرگری گەوهەری شارستانیەکانەوەیە. کۆمەڵگا دیموکراتەکان و تاکە ئازادەکانی، لەسەردەمی شارستانیەتی چینایەتیدا بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن، رووبەڕووی کێشەی گەورەی بەرگری بوونەتەوە. تەنانەت کۆمەڵگاکانی کۆمینەی کۆمیناڵی سەرەتاییش، لە قۆناخی درێژخایەنی ژیانیاندا شانبەشانی ئەو ناکۆکییە ناوخۆییانەی لەنێوان خۆیاندا هەیانبوو، بەهۆی بوونەوەرە جیاوازەکانەوە رووبەڕووی مەترسی کوشندە بوونەتەوە و لەهەر شوێن و ساتێکدا بەرگری خۆییان بە یەکەمین ئەرك داناوە.
لەبەرامبەر ئەو گوشارو چەوسانەوە پاوانخوازییەی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری"دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم" لەسەر کۆمەڵگا ئابووری، ژینگەپارێزی و دیموکراتیەکان و تاکە ئازادو یەکسانەکانیان بەڕێوەیان بردووە، کێشەی بەرگری خۆیی لەسەرووی بابەتە ژیانیەکانەوە دێت. ژیانێکی بێ بەرگری خۆیی تەنیا بەکۆیلایەتیەکی مووچەدار ئەنجامگیر نابێت، بەڵکو رێگا لەبەردەم هەرجۆرە بێکاری، نەخۆشی و گەندەڵیەك دەکاتەوە. لەمەش خراپتر، چەندین کۆمەڵکوژی جەستەیی و کلتووری لەگەڵ خۆیدا دێنێت. مۆدێرنیتە وەك سیستەم بەگشتی کۆمەڵگا و تاکەکانی، بەتایبەتیش بەشێوەیەکی دژوارتر کۆمەڵگای دیموکراتی و تاکە ئازادەکانی، بە ناچاری رووبەڕووی پاراستنی هەبوونی خۆیان دەکاتەوە. ئەگەر لە بەرگری خۆییدا سەرکەوتوو نەبن، نەك تەنیا ئازادییەکەیان، بەڵکو هەبوونەکەشیان دووچاری مەترسی جینۆساید دەبێتەوە. فاکتەرە پاوانخوازەکانی مۆدێرنیتە، بە ئامانجی درێژەدان بە بوونی خۆیان، تەنیا بەهەڕەشەکردن لەئازادی و هەبوونی کۆمەڵگا و تاکەکانەوە ناوەستێت، بەڵکو لەسەردەمی هەرە دواییشیدا هەلومەرجی ژینگەش لەناودەبات کە بۆ ژیان دەستلێبەرنەدراوە. لەناوبردنی هەلومەرجەکانی ژینگە، جۆرێك لەجۆری جینۆسایدەکانە کە لە ماوەیەکی درێژدا بەسەر تەواوی ژیان پەیرەو دەکرێت.
کۆمەڵگای دیموکرات و تاکی ئازاد، بە ئەندازەی گۆڕانکاریەکانی شۆڕش و پەرەسەندن ناچارن رێگەچارەیەك بۆ کێشەکانی بەرگری خۆییش بدۆزنەوە. دوا قۆناخی قەیرانی بونیادی مۆدێرنیتە کێشەکانی بەرگری خۆیی لەسەرووی هەموو کێشەکانەوە جێگیر کردووە. بە ئەندازەی یەکینەیەکی ئابووری، ژینگەیی و دیموکراتیك هەر جڤاتێك ناچارە وەك یەکینەیەکی بەرگری گەوهەری بژیت. لەهەمانکاتدا هەر تاکێکی ئازاد، یەکسان و دیموکرات

بەو ئەندازەیەی ناچارن لە یەك یان چەندین یەکینەی دیموکراتی، ئابووری و ژینگەپارێزیەوە بژین لەگەڵ ئەوەشدا ناچارن لە یەك یان چەندین یەکینەی بەرگری خۆییدا بژین. خۆراك، زۆربوون و پاراستن کە بۆ سەرجەم زیندەوەرو بوونەوەران پێویستە، لە هەمووشیان زیاتر سێ مەرجی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤن.

بەشی سێیەم: لەتورکیادا کێشەی دیموکراسی و رێگەچارەی دەستوری دیموکراتیانە

ا ـ دەرکەوتن و پەرەسەندنی کێشەی دیموکراسی لە تورکیاو دەرەنجامەکانی

وەك دیاردەیەکی گەردوونی کێشەی دیموکراتی، لەگەڵ جیابوونەوەی بەڕێوەبەرایەتی پلەداری سەروو لە جڤاتەکانی قەبیلەدا سەریهەڵداوە. جیابوونەوەی ئیداری لەکۆمەڵگای تیرەکاندا کۆتایی بەو دیموکراسییە سروشتییە دێنێت کە لەناو کۆمەڵگاکانی قەبیلە لە ئارادابوو. لەپلەدارییەوە گوزەرکردن بۆ دەوڵەتی داپلۆسێنەر، ئەو قۆناخ و پرۆسەی قووڵتر کردۆتەوە. سیستەمی شارستانی لەناوەرۆکدا لەلایەن ئەو پرۆسەوە دیاری دەکرێت. تا سەردەمی سەرمایەداری لە ئەوروپا، تا رادەیەکی سنووردار شارستانی نفوزی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت. کۆمەڵگاش هێزی توانستە ئەخلاقی و سیاسیەکانی دەپارێزێت. شارستانیەتی ئەوروپا لەمیانەی ئەو جیاکاریەی بۆ دیاردەکانی نەتەوە و دەوڵەت ـ نەتەوە ــ سەرمایەداری و پیشەسازگەرایی ــ دانی پێداناوە لە قووڵاییدا کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی پارچە دەکات، بۆ ناو قووڵاییەکانی کۆمەڵگا دزە دەکات. ئەو دزەکردنەی بەشێوەی دەسەڵاتی ئایدیۆلۆژی و پاوانکاری سەرمایە رووەدەدات، رێگا لەبەردەم ستەمکارییەك دەکاتەوە هاوتاکەی لە مێژوودا نەبینراوە. بەمجۆرە مۆدێرنیتە تاك دەخاتە لاوازترین دۆخەوە. لەرێگای ریفۆرمی سنووردارەوە هەوڵی بەربەستکردنی خەبات و تێکۆشان دەدرێت. دیموکراسیەتی ئەوروپا لەمیانەی ریفۆرمەوە هەوڵی لەسەرپێ هێشتنەوەی تاك و کۆمەڵگا دەدات. ماف و ئازادیەکانی تاك و دەوڵەتی یاسا، ناوەرۆك و چوارچێوەی ئەو دیموکراسییە پێکدێنێت. یەکێتی ئەوروپاش گوزارە لە دۆخی سیستەماتیکی ئەو بنچینەیە دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی سیستەمی قۆرخکار باڵادەستی خۆی لەسەرەوە بەردەوام دەکات، ئەو سیستەمە دیموکراتییەی دێتە ئاراوە، جگە لە سیستەمێکی دەسەڵاتی کۆنترۆڵکراوو بەرتەسك و سنووردارکراو بەولاوە ناچێت. کێشەی دیموکراسی بەردەوام دەبێت.
کلانە تایبەتەکانی سیبیریا، کە لە سەردەمی توانەوەی بەستەڵەکەکانی بنارەکانی باشووری سیبیریا لەساڵانی "7000"پ . ز بەدواوە، لەژێر کاریگەریەکانی شۆرشی نیولیتیکی رەچەڵەکەکەی بۆ رۆژهەڵاتی ناوین دەگەڕێتەوە، لەماوەی ساڵانی"4000" پ.ز بەرەو ئەنجامدانی شۆرشی نیولیتیکی خۆیان هەنگاو دەنێن. لە ساڵانی"2000"پ.ز پش لەپلەداری"هیرارشی"یەوە دەربازبوون بۆ شارستانیەت و دەوڵەت دەستپێدەکات. یەکەمین شارستانیەتی کە ناوەندەکەی چینی ئەمڕۆمان بووە، لەساڵانی "1500" پ.ز دێتە سەر شانۆی مێژوو. بەردەوام لەگەڵا قەبیلەکانی دەوروبەریان لە ململانێدان کە بەپرۆتۆتیپەکانی ئەمڕۆکەی گەلەکانی ژاپۆن، کۆریا، ڤێتنام، مەغۆلستان، تورکستان دادەنرێن. دەشێت ئەو تێکۆشانەیان لەبەرامبەر شارستانیەتی چین، وەك دیموکراسی سروشتی هەڵسەنگێنێت. لەتۆمارەکانی مێژووی چین دا دەبینرێت کە بۆ جاری یەکەم بەناوی "هوون" باسی باوباپیرانی تورکەکانی ئەمڕۆ کراوە. لەبەرئەوەی تیرەکانی "هوون" لە دیموکراسیەتێکی سەرەتاییدا دەژین، لەگەڵا شارستانیەتی چین دا بەردەوام لەناو شەڕو پێکداداندابوون. بەئاسانی ناکرێن بە شارستانی. کاتێك ئەو تیرانە فشاریان بۆ دێت، رووی خۆیان لە رۆژئاوا دەکەن. هوونەکانی رۆژئاوا لە ساڵانی"400"پ.ز دا تا ئەوروپای ناوین و رۆما، لەهەرێمێکی بەرفراواندا درێژە بە بوونی خۆیان دەدەن. بەڵام ناتوانن خۆیان لەتوانەوە لەناو شارستانیەتدا رزگاربکەن. لە رۆژهەڵات لەلایەن شارستانیەکانی چین، لە رۆژئاواش لەلایەن شارستانیەتەکانی کە بنەچە سلاڤین، بەردەوام دەتوێنرێنەوە "ئاسیمیلەدەکرێن". هەرچەندە پێشتر لەمیانەی ئایینەکانی هیندۆس و مانیزم هەوڵی شکاندنی ئەو قۆناخە دراوە، بەڵام شکاندنی راستەقینە لەرێگای ئیسلامیەتەوە رووەدەدات. ئەزموونی دەوڵەتەکانی گۆکتورك و ئویگووریش کە پێشتر لە ساڵانی"550 و 740" هەوڵی ئاواکردنیان دراوە، لەکۆنفیدراسیۆنێك زیاتر بەولاتردا نەچووە.
شارستانیبوونی بنەرەتی پرۆتۆ ـ تورکەکان لەسەدەی نۆیەمدا دەستی پێکرد کاتێك بەشێوەیەکی جدی لەگەڵ ئیسلام کەوتنە پەیوەندی و پەسەندیان کرد. کێشەکانی تورکبوون و دیموکراسی کە بە قەرەهانەکانەوە دەستپێێکردو تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو قۆناخەی شارستانیەتە. شارستانیەتی تورك ـ ئیسلامی رۆژهەڵاتی ناوین، بەگشتی لەمیانەی سەلجوق بەگ و میرنشینی سەلجۆقیەوە دەستپێدەکات. بەر لە پرۆتۆ ـ تورکەکانیش هەوڵیانداوە جێگای خۆیان لە شارستانیەتەکانی رۆژهەڵاتی ناویندا بگرن. بەڵام زۆرباش دەزانرێت کە بۆ جاری یەکەم بەشێوەی بەکۆمەڵ و وەك تیرە لەمیانەی سەلجوق بەگ و کورەکانیەوە

لەرۆژهەڵاتی ناوین جێگیربوون. لەکاتێکدا خودی سەلجوق بەگ هەوڵیدەدا لەرۆژهەڵاتی ناوین شوێنێك بۆ خۆی بە دەست بێنێت، رووبەڕووی دوو شەپۆلی ئایینی بۆتەوە: موسەویەت و محەممەدییەت. ئەو ناوە موسەویانەی لەچوار کورەکەی ناوە، نیشانیدەدات کە تا رادەیەکی زۆر بە دەوڵەتی تورکی یەهودی هازاراوە کاریگەر بووە. لەبەر ئەوەش دیار نییە چەندە بووە بە موسڵمان. دەشێت تورکێتی بە ئیسلامەوە بەستربێتەوە. چونکە لەدەرەوەی ناوی گۆکتورك کە کورتخایەن بوو، بەر لەوە رووبەڕووی هیچ شارستانیەتێك نابینەوە ناوی تورك بێت. شیمانە دەکرێت ئەو ناوە لەلایەن عەرەبەکانەوە دانرابێت. بەڵام پێویستە زۆر باشبزانرێت کە بەرلەوەی سەردەمی نەتەوەپەرستی دەستپێبکات، کۆمەڵگاکان ناسنامەکانیان لەمیانەی ناوی ئایینەوە دەستنیشان دەکرد نەك بەناوی رەچەڵەکەوە. لەو کاتەدا یان ئیسلام یان ئایینێکی تر بوو. راستینەی کۆمەڵگا بەو شێوەیە ئاواکرابوو.
لەسەدەی "11" بەدواوە میرنشینی سەلجوقی هەوڵدەدات باڵادەستیەکی توند بەسەر تیرەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆی ئاوا بکات. لەبەرامبەر ئەوەشدا تیرەکان بەرخودانێکی دژوار دەکەن. بەگوێرەی تۆمارەکانی مێژوو، کەسانێك سکاڵایان کردووە سەبارەت بە دژواری دەسەڵاتی بەگی تیرەکانی ئۆغوز ـ تورك کە لە ساڵی "1017"دا چوونەتە ئێران. ئەو یەکەمین کۆمەڵەی نزیکەی"5000"هەزار کەس بوونە، رزگاری خۆیان لە راکردن بۆ ئێران بینیوو. ئاشکرایە کە ئەو تیرانەی دەربازی رۆژهەڵاتی ناوین بوونە، هەر لەسەرەتاوە بەرخودانێکی دژواریان لەبەرامبەر شارستانیەت کردووە کەوەك شار ـ چین ـ دەوڵەت پەرە دەسەنێت. لقی ئەو تیرانەی هەوڵی چەوساندنەوەو بەکۆیلەکردنیان دەدراو ناوی تورکمانیان وەرگرتووە، یەکەمین ناوکی گەلی ئەمڕۆن. وەك چۆن ئەرستۆکراسی تیرەکان تورکمانیان بچووك دەبینی، تەنانەت ناشیانەوێت خۆیان وەك تورك ناودێربکەن. حەزیان لەناوەکانی عەرەب و فارس، سیفەتەکانی شا و سوڵتانە. زمانی تورکی لەبیر دەکەن. زمانی عەرەبی، فارسی و عوسمانی بەکاردێنن کە لەهەموویان پێکدێت. تورکێتی رەسەنیش لە تیرە تورکمانەکاندا ژیانداری دەکرێت.
ئەگەر ئەو کورتە مێژووە لەلایەنی کێشەی دیموکراسیەوە شرۆڤە بکەین، ئەوا دەتوانین بڵێین:
تیرە تورکەکان لەگەڵ هاتنیان بۆ خۆرهەڵاتی ناوین لە سەدەی یازدەهەمەوە جیابوونەوەیەکی چینایەتی جدییان بەخۆیانەوە بینی، دەشێت ئەو قۆناخە وەك سەرەتای دەستپێکردنی کێشەی دیموکراسی تاوتوێ بکرێت. کاتێك تیرە تورکمانەکان دوا سوڵتانی سەلجوقی سوڵتان سنجار دەخەنە قەفەسێکەوە و تا مردنی لەگەڵا خۆیاندا دەیگێرن، لەڕاستیدا زۆرباش روونی دەکاتەوە کە چەندە ئالوودەی ئازادی و ژیانی دیموکراسین.
لەرێگای ئیسلامیەتەوە جیابوونەوەی تیرە تورکەکان بۆ دوو گرووپی سەرەکی، ناوەڕۆکی کێشەی دیموکراسی پێکدێنێت. لەکاتێکدا ئەرستۆکراسەکان، لەڕاستیدا ئارستۆکراسیەتی سەربازی و ئایینی و زەویدارەکان، لەناو دەوڵەتدا چڕبوونەوەو پاوانی دەسەڵاتیان ئاواکردووە، بەشی دووەمیش ئەو هەژارانەی لە سیستەم دوورخرابوونەوە یان وەك تیرە رەوەندە کۆنەکان کوێستان و گەرمیانیان دەکرد، یان وەك هەژارەکانی شارو گوند ژیانیان بەپیشەوەری و جووتیاری بەسەردەبرد. ئەو دابەشبوونەی لەناو سەرجەم گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین روویداوە، بە یاخیبوون و کۆرەوێکی زۆر ئەنجامگیر بووە. دابەشبوونی مەزهەبیش بەو راستیانەوە گرێدراوە. لەکاتێکدا سوننەگەرایی وەك ئایینزای چینی سەردەست فەرمی بوو، ئایینزا بەرهەڵستکارەکانی وەك عەلەوی، شیعەگەرێتی، موعتەزیلە، مەولەویەت و بەکتاشیش، بەشێوەیەکی نیمچە نهێنی هەوڵی بەردەوامبوون دەدەن. لەچاخی ناویندا تێکۆشانی دیموکراسی لەشێوەی ئەو فەنۆمەنە ئایینزاییانەوە ئەنجامدەدرێت. لەمیانەی ئەو مەزهەبانەوە هەوڵی دیموکراتیزەبوونی ئەو قۆناخە دەدرێت. هەروەها خودی ژیانی خێڵە کۆچەرەکان خۆی تێکۆشانی دیموکراتییە. هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکی بەرخودانکاری سەرجەم سیستەمی خێڵا و تیرەکانی چاخی ناوین، وەك تێکۆشانی دیموکراتی راستترین شێوەی گوزارشتکردنە.
ئەگەر ئیسلامی فەرمی وەك پاوانێکی ئایدیۆلۆژی شرۆڤەبکەین، دەشێت ئایدیۆلۆژیای ئایینزا نیمچە نهێنیەکانیش وەك بێژەی دیموکراتی هەڵسەنگێنرێت. ئەو بزاڤە دیموکراتییە جەماوەریانەی تا سەرەتای سەدەی"19" بەردەوام بوو، لەگەڵ زیادبوونی نفوزی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە رۆژهەڵاتی ناوین، ئەوا دەکەوێتە قۆناخێکی نوێوە. لەکاتێکدا هێزە کۆنەکانی هەژموونگەرایی واتە ئیمپراتۆریەت لەمیانەی هێرشی دەوڵەت ـ نەتەوە پەرتەوازە دەبوون، ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکانەش کە جێگایان دەگرتنەوە، کێشەی دیموکراتی هێشتا سەختتر دەکەن. دەوڵەت ـ نەتەوەکان نوێنەرایەتی نامۆبوونێکی دوو بەرابەر دەکەن: لەلایەکەوە نامۆبوونی دەسەڵات کە لە شارستانیەتی کۆنەوە ماوەتەوە، لەلایەکیتریش نامۆبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دایدەسەپێنێت. قۆرخکاری دەسەڵاتدارێتی کە چەندین قات زیادیکردووە، رژێمگەلێك لەسەر کلتووری گەلان بەرێوە دەبات کە بە ئاستی جینۆساید دەگات. سەرمایەداریبوون، بۆرژوازیبوون و فاشیستبوون، بەشێوەیەکی تێکەڵ بەدەستی دەوڵەت بەرێوەدەچن. لەگەڵ دەستپێکردنی سەدەی"20"م تورکیاش بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان ئەو قۆناخەی بەخۆوە دیوە. ئەو بزووتنەوەی خۆی بەناوی جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی ناودێر کردووە، گوزارشت لەو راستییە دەکات.
سەرجەم نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی پرۆتۆتیپی پارتی سۆسیالیست ناسیۆناڵی ئەڵمانیا و پارتی فاشیستی ئیتاڵیای ساڵانی"1920"ە. بینینی گۆرانکاریەکی هاوشێوە لەزۆربەی ئەو وڵاتانەی کە درەنگ بوون بە سەرمایەداری رێکەوت نییە، بەڵکو پەیوەندی بەهەبوونی مۆدێرنیتەی

سەرمایەدارییەوە هەیە. لێرەدا بەرپرسیارێتی بۆرژوازی بیرۆکراتی دیاریکەرە کە تەنیا لەرێگای جینۆسایدو شەڕی دژواری چینایەتی دەتوانێت خۆی لەقەیرانی مۆدێرنیتە رزگار بکات کە تادەچێت قووڵتردەبێتەوە .
هەروەها رۆڵی بزاڤی سۆسیالیزمی بونیادنراویش لەوەدا بچووك ناکرێتەوە کە لەهەمان قۆناخدا هەوڵی بە سیستەمبوونی دادو فاکتەرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزمی مۆدێرنیتەی، بۆ کردبوو بە ئامانجێکی سەرەکی. نەك تەنیا دیموکراسی، تەنانەت خودی گەلیش، واتە دیمۆسیش رووبەڕووی کێشەی مان و نەمان بوویەوە. دەشێت سەردەمی هەردوو شەڕی جیهانی و ماوەی نێوانیشیان، وەك سەرشێتی مسۆگەرکردنی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر تەواوی جیهاندا شرۆڤە بکرێت کە لەرێگای سێ فاکتەرە سەرەکی (سەرمایەداری، دەوڵەت – نەتەوە و ئیندوستریالیزم) یەکەیەوە بەڕێوەیدەبرد. لەکاتێکدا چەندین نەتەوە، گەل و کلتوور هەتا سەر ئێسقان رووبەڕووی هەڕەشەی ئەو سەرشێتییە بوونەوە، ئەوانەی کە دەرفەتی رزگاربوونیشیان بینی، نەیانتوانیوە خۆیان لەخۆ بەزلزانین و تەسلیمبوون بەسیستەمی باڵادەست رزگاربکەن. ئەنتەرناسیۆناڵەی کە ناتوانێت مۆدێرنیتە تێپەڕێنێت، ئەزموونەکانی بەرەی رەنج و گەل و بەرەی دژە فاشیزم کە سێیەمین ئەنتەرناسیۆنالیزم ـ کە مۆدێرنیتەی دەرباز نەکرد ـ لەساڵانی"1930" هەوڵی پێشخستنیدا، شتێکی ئەوتۆی بۆ دیموکراسی بەدەستنەخست. دیموکراسیەتی لیبراڵ و دیموکراسی گەلەری سۆسیالیزمی بونیادنراویش کە دوای دووەمین شەڕی جیهانی و لە سەردەمی شەڕی ساردا لە ئارادابوون لە ناوەڕۆکدا نکوڵیکردن بوو لە دیموکراسی. بەڕێوەبردنی شەڕی هەژموونگەرایی بە جیلوەی دیموکراسیەوە، تەنیا مەسەلەیەکی تەکتیکی بوو. هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەڕاستیدا هەڵوەشانەوەی لیبرالیزمیش بوو. لەکاتێکدا جیهانی دوای ساڵانی"1990"یش بەقەیرانی بونیادی سیستەمەوە سەراوژێر ببوو، کێشەی دیموکراسیش بەهەموو قورساییەکەیەوە خۆی خستە رۆژەڤەوە. دیموکراسیش لە ئاستی دونیادا لەبواری شێوەو ناوەڕۆکەوە سەرلەنوێ لە هەوڵی خۆ پێناسەکردنەوە دابوو، وەك مۆدێرنیتەی دیموکراتی دەیویست خۆی بەسیستەم بکات.
لەو قۆناخەی سەراوێنبوونی دونیادا لەکاتێکدا تورکیا رووبەڕووی کێشەی مان و نەمان بوویەوە، لەلایەکی تریشەوە وەك کۆمار چانسی سەرەتایەکی نوێی بەدەستهێنا. دەشێت کەسایەتی مێژوویی مستەفا کەمال ئەنجامدەری ئەو سەرەتایەو کۆمار وەك دوو کەینونەی هاوتا شرۆڤە بکەین. شیکارکردنی ئەودوو هەبوونە لەرۆژی ئەمڕۆشماندا هێشتا گرنگی خۆی پاراستووە. مستەفا کەمال کاتێك دەڵێت بیرۆکەی کۆماری وەك رازێك شاردەوەو لەرۆژێکی گونجاویشدا رایگەیاند، لەراستیدا ئەو گرنگییە دەخاتە روو. هێندە پرسیاری "کۆمار لەبەرامبەر چی و چۆن پێکهات؟" پرسیاری" سەرچاوەی خۆی لەکامە گەردوونیبوونەوە وەردەگرت؟" هێشتا لەهەوادایەو بێ وەڵام ماوەتەوە. وەك وشە دیموکراسی بوو یان نا؟ ئەگەر دیموکراسی نەبووە ئەی بۆ بەم رەوشە گەیشتن؟ ئەمانە ئەو پرسیارە سەرەکیانەن کە پێویستییان بە وەڵامێکی راست هەیە. لەرێگای شیکارکردنی راستیەکانی ژێر ئەو کێشانە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا دەتوانین بە تەواوی لە کێشەی دیموکراسی تێبگەین کە تەواوی ژیانی تورکیای قوفل کردووە.
بۆ رۆشنکردنەوەی ئەو بابەتە، بەتەنیا لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی نزیکی تورکیا بەش ناکات. هەر وەکو لەهەر وڵاتێکیتری جیهاندا روویداوە، رەوشی تورکیا و هاوشێوەکانیشی تەنیا لەمیانەی گرێدانی بە بەشارستانیەتی هەژموونگەرایی ئەورووپای هەڵکشاو مایەی تێگەیشتن دەبێت. لەو قۆناخەدا سیستەمی هەژموونگەرا گەورەترین شەپۆلی جیهانیبوون بەخۆیەوە دەبینێت. ئاشکرایە کە دابڕاو لە سیستەمی هەژموونگەرا لێکۆڵینەوەی گۆڕانکاریەکانی هەر گۆشەیەکی ئەو جیهانە ناتەواوەو کورت دەهێنێت. دووەمین خاڵی گرنگ ئەگەری پەیوەندی وەرچەرخانەکانی تورکیایە لەگەڵ قەڵەمبازە رەسەنەکانی تورکیا. لێرەدا ئەو زاراوەی رۆڵی کلیل دەبینێت جاکۆبینیزمە. تا دەرك بە جاکۆبینیزم نەکرێت کە بە ئاشکراترین شێوە لە شۆڕشی فەرەنسادا دەرکەتە مەیدان، بەڵام بوونی خۆی لە هەموو شۆڕشەکانی مۆدێرنیتەدا پیشانداوە، ئەوا ناتوانین لە جاکۆبینیزم ئەنجامەکانی لە گۆشەکانی تری جیهان تێبگەین، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەوەی تورکیا.
بەر لە هەموو شتێك پێویستە ئەو ئەگەرە دابنێین کە جاکۆبینیزم وەك گەردوونیبوونی مۆدێرنیتە بۆتە فەنۆمەنێك. جاکۆبینیزم رۆڵێکی ناوەندی بینی لەتێپەڕاندنی نەریتی تیۆکراتی"5000"ساڵە کە مۆرکی خۆی لە شارستانیەتی ناوەندی دابوو. وەك چین نوێنەرایەتی توێژی ناوینی بۆرژوازی دەکات کە دەیەوێت ببێتە دەسەڵات. توێژی رادیکاڵی بۆرژوازی شۆڕشگێرە. هەم وەك ئایدئۆلۆژیا و هەم لەبواری چالاکیش گوزارشت لە رادیکاڵیزم دەکات. رەوشی داگیرکاری هێزێکی بیانی بە گونجاوترین هەلومەرجەکانی دەسەڵاتی خۆی دەبینێت. ئەگەر رەوشێکی ئاشکرای داگیرکەری لە ئارادا نەبێت، چانسی دەسەڵاتدارێتی بۆرژوازی جاکۆبەن زۆر کەمە. تەنیا کاتێك تەواوی کۆمەڵگا سەیری کارەسات وماڵوێرانی داگیرکارییان کرد، دەبێتە بەرەبەیانی جاکۆبینیزم. بۆ ئەوەی وەك دەسەڵاتدار دەرکەوێتە سەر شانۆی مێژوو، ئیتر هەتا دوایی دەرفەت رەخساوە. کۆمەڵگا بەدوای فریادڕەسێکدا دەگەڕێت. مۆنارشییە تیۆکراتیەکانی خاوەنی دەسەڵاتدارێتی باو، نەك تەنیا رێگری لە داگیرکەری ناکەن، بەڵکو ئیتر دەمێکە رۆڵی نۆکەرایەتییان پەسەندکردووە. تەنیا لەمیانەی هاوکاری بەهێزی هێزە بیانیەکان دەتوانن بەرژەوەندیەکانیان بپارێزن. هەربۆیەش لەناو کۆمەڵگادا رەوابوونی خۆیان لەدەستدەدەن. لەم دۆخەشدا ئەو توێژەی پێگەی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنی زۆر لەبارە، چینی ناوینە کە لەدەرەوەی چینی ژووری بەکرێگیراوە. لەناو ئەو چینانەشدا بۆرژوازی جاکۆبەن هێزی هەرە پەروەردەکراوو رێکخراوە. دەشێت پرۆتۆتیپی جاکۆبەنەکان لە شۆڕشی هۆلەنداو بەریتانیادا ببینرێت. بۆ نموونە لە

ساڵانی"1640"دا ، واته زۆر پێش له شۆڕشی فەرەنسا، کرومۆل سەرۆکی گەورەترین شۆڕشی جاکۆبەنیەکانی بەریتانیا کە سەری پاشایان پەڕاند. لەراستیدا گەورەترین شۆڕشی جاکۆبەن ئەوەنییە کە لەساڵی"1792" لە فەرەنسا روویداوە، بەڵکو ئەو شۆڕشەی بەریتانیایە. فەرەنساش کۆپی"ڤێرسیۆن" دووەم یان سێیەمینی ئەو مۆدێلەیە.
هەرچەندە بەشێوەیەکی جیاوازیش بێت، بەڵام دەشێت هۆڵەندا وەك وڵاتی بنەڕەتی شۆڕش شرۆڤە بکرێت کە جاکۆبینیزمی تێدا هەوێن بوو. نەك تەنیا کاتێك چینی باوی سەروو دەکەوێتە رەوشێك ناتوانێ بەڕێوەبەرایەتی بکات، بەڵکو لەدۆخێکدا چینی هەژارانی ژێرەوەش لەبواری رێکخستنی و ئایدیۆلۆژی بۆ بەڕێوەبەرایەتی تێری نەکرد ئەوا جاکۆبینیزم تەڤگەری دەسەڵاتدارییە. کاتێك هەمان هەلومەرج لەهەرسێ وڵاتدا دروست بوون، جاکۆبینیزم بەدروشمە راشکاوەکانی سەربەخۆخوازی، ئازادیخوازی و یەکسانخوازییەوە پێشەنگایەتی رابوونی زۆربەی زۆری کۆمەڵگا دەکات. ئان و ساتی هەستیار، ئەو کاتەیە کە زۆربەی زۆری کۆمەڵگا بۆ دەسەڵاتدارێتی رادەبێت. ئەو ساتانە ئانێکن کە گۆڕانە گەورەکان دەکەونەوە ناو منداڵدانی دایکەوە. هەموو شتێك تا مۆخی ئێسقان دەهەژێن. ئەو هەژاندنە بۆ لە دایکبوونی نوێیەکە پێویستە. ئەو ساتە هەستیارەی فەرەنسا لە نیسانی "1792"دا دەستپێدەکات. پاشای بەکرێگیراو تەنیا لەمیانەی هاوکاری ئارستۆکراتەکانی ئەوروپا لەبەرامبەر شۆڕشی ساڵی"1789" هەوڵی دژە شۆڕش نادات، بەڵکو لەهەمانکاتدا لەدۆخی راکردنیش دایە. توێژە میانڕەوەکانی چینی ناوین ژیرۆندەرەکان"هێڵی راستڕەو لە شۆڕشدا"، لە هاوێشتنی هەنگاوی رادیکاڵدا دەترسن. کۆمۆنیستە بابووفیەکانی"یەکێکە لە کۆمۆنیستەکانی سەرەتا لە فەرەنسا" ژێرەوەش، لەرەوشێکی زۆر لاوازدانە. هەلومەرج بۆ جاکۆبەنەکان زۆر لەبارە. ئیتر یەکێك لە قۆناخە هەرە گەورەکانی تیرۆری ناسراو لە مێژوودا لەژێر ئەو هەلومەرجانەدا پەیرەو دەکرێت. لە تەمووزی"1794"دا دوای پەڕاندنی سەری رێبەری جاکۆبەن رۆبسپێر، ئەو قۆناخە کۆتایی دێت. قۆناخی"1792 ـ 1794" لەهەمانکاتدا یەکەمین قۆناخی کۆماری شۆڕشگێڕە. دوای"1794" بەشێوەی قۆناخی جیاوازیش تێپەڕبووبێت، لەناوەڕۆکدا ئەوەی لێگەڕینی بۆ دەکرێت سیستەمێکی نوێیە. ئەو لێگەڕینە لە قۆناخی کۆماری پێنجەمەوە تا رۆژگاری ئەمڕۆشمان بەردەوامە.
لەشیکارکردنی جاکۆبینیزمدا، پێویستە بە هێڵی ئەستوور ئاماژە بە هەندێك فاکتەر بکرێت. یەکەمیان؛ بزووتنەوەیەکی کەمینە نییە، بەڵکو بزووتنەوەیەکی جەماوەرییە. دووەمیان؛ هەرچەندە دروشمەکانی ئازادی و یەکسانیش زۆر بەکارهێنرابن، لەبنەڕەتدا بزووتنەوەی رادیکاڵی دەسەڵاتدارێتی چینی ناوەڕاستە. دەشێت بە سەردەمی دیکتاتۆریەتیش ناوببرێت. سێیەمیان؛ دوای ئەوەی هەڕەشە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بەرامبەر وڵات و کۆمەڵگا لە ئارادا نەمان، دوای لەدەستدانی هەلومەرجی مادی، بزووتنەوەی جاکۆبەن لە داڕووخاندایە. بەگشتی شوێنی خۆی بۆ هێزە راستڕەوەکان جێدێڵێت، بە دەگمەنیش، بۆ هێزە چەپەکان. ئەمەش لەکۆمۆنەی پاریسی"1870"دا و بەر لەویش لە هەندێك بزووتنەوەی شۆڕشی هەندێك لە وڵاتان لە "1848"دا دەبینرێت کە ماوەیەکی کەم بەردەوام بوون.
خاڵێکی دیکەی گرنگ کە پێویستە پەیوەست بە جاکۆبینیزمەوە دەستنیشان بکرێت؛ کاتێك کە هەستایە سەرپێ خۆی وەك تەواوی نەتەوەو دەوڵەت ـ نەتەوەی نوێ "کاتێك چووە دەسەڵات" رادەگەیەنێت. ئەو نەتەوەو دەوڵەت ـ نەتەوەیە لەراستیدا ناوو شێوەی پیرۆزکراوە نوێیەکەیە کەکەوتۆتە شوێنی گەردوونیبوون، ئەکۆمەنیزم، ئومەتگەرایی کە فۆرمی کۆمەڵگای نەریتین. ئەو نەتەوەو دەوڵەت ـ نەتەوەی تازە راگەیەنراوە، ئایینی نوێیە. وەك ئایینێکی نوێ دەرکی پێدەکرێت کە شوێنی ئایینی کۆن دەگرێتەوە. راگەیاندنی رووکەشیانەی پیرۆزییەکی نوێی کۆمەڵگا بۆ دەسەڵاتدارێتی مەرجە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا لەلایەن ئومەتی کۆندا سەراوبن دەکرێن. لەدایکبوونی وشك و دژوارانەی دەوڵەت ـ نەتەوەی فەرەنسا، لەنزیکەوە پەیوەندی بە تیرۆریزەکردنی هەلومەرجەکانی شۆڕشەوە هەیە. تیرۆریزەکردنی شۆڕش، یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی رادیکالیزمی چینی ناوین. هەندێك جار بۆ ئەوەی ببێتە دەسەڵات، پێویستی بەتوندڕەوی و بێڕەحمبوون دەبینێت. کاتێك چانسی دەسەڵاتداربوونیش نەما لەبەر هەمان هۆکارە بەشێوەیەکی خێرا بەرەو پاسیفیزم دەچێت. کاتێك ئومێدو هەلومەرجەکانی دەسەڵاتدارێتی لاوازبوون، ئەو بەشەی بەشێوەیەکی خێرا دەکوژێتەوەو زیاتر رادەستی هێزە راستڕەوەکان دەبێت، دیسان لەناو جاکۆبەنەکان دەردەکەون. بەشێکی کەمیشیان رادیکاڵتر دەبن، یان دەچنە ریزی کۆمۆنیستەکانەوە، یان خۆیان بۆ بزووتنەوەیەکی کۆمۆنیستی دەگۆڕن. لە هەموو قۆناخە شۆڕشگێڕیەکانی ئەوروپا و دواتریش لە تەواوی جیهاندا، دەشێت ئەو گێژاوە ببینرێت. خاڵێکی تری زۆر گرنگ کە پێویستە لە راستینەی ئەوروپادا روونبکرێتەوە، پەیوەندی فاشیزم و بەلشەفیزمە بە جاکۆبینیزمەوە.
بێگومان جاکۆبینیزم لە"1794"دا کۆتایی نەهات، بەڵکو درێژەی بەبوونی خۆیدا. بە شێوازی جۆراوجۆر مۆرکی خۆی لە هەموو قۆناخەکانی شۆڕشەکانی دوای خۆیداوە. رۆڵی باوکی نەتەوەگەرێتی و دەسەڵاتگەرێتی زێدەرۆیی چینایەتی دەبینێت. نەتەوەگەرایی ئەڵمان و شێوە هەرە زێدەرۆیەکەی نازیزم چەندە خاوەنی ریشەی جاکۆبەن بێت، نەتەوەگەرایی رووس و بەلشەفیزمیش بەو رادەیە ریشەکەی جاکۆبەنە. ریشەکانی فاشیزمی ئیتالیاش بەشێوەیەکی زۆر ئاشکراتر خۆیان دەسپێرنە جاکۆبینیزمەوە. نازیزم و فاشیزم ( دەشێت هەموو فاشیزمەکانی لەسەر زیادبکات) تیرۆریستانەترین شێوەی دەسەڵاتدارێتی بۆرژوازی پاوانخوازی جاکۆبەنەکانە، بەلشەفیزمیش (هەمان شت لەبارەی هاوشێوەکانیشی راستە) تیرۆریزمی ئەو توێژانەیە کە بەناوی چینی ژێرەوە بوونەتە دەسەڵات. لە هەردووکیشیاندا بە شێوەیەکی زێدەرۆییانە نەتەوەو دەوڵەت ـ نەتەوە بونیادنراوەو

گوزارەی لێکراوە، وەلێ بەناوی جیاوازەوەیە. بەڵام حاشاهەڵنەگرە کە ریشەیەکی هاوبەشی جاکۆبەنیان هەیە. لێرەدا گرنگترین خاڵی کە پێویستە روونبکرێتەوە؛ لە راستیدا بەلشەفیکەکان تاچەند ببوون بە کۆمۆنیست. سەرباری بانگەشەکانیشیان من خۆم لەو باوەڕەدام کە ریشەی بەلشەفیکەکان جاکۆبەنەو نەیانتوانیوە بە تەواوی ببنە کۆمۆنیست؛ وەرچەرخانێکی کۆمۆنیستییان ئەنجامنەداوە. کارەکتەری دەسەڵاتدارێتی و نەتەوەپەرستی چینایەتییان وایان لێدەکات کە خۆیان وەك دەوڵەت ـ نەتەوە وێنا بکەن. دەوڵەت ـ نەتەوەش رژێمی سەرەکی دەوڵەتی سەرمایەدارییە کە لەدژی دەرکەوتوون. کاتێك پێشەنگایەتی ئیندستروپالیزم دەکەن و دەرکەوتنیان وەك مۆدێرنیستی رادیکاڵا دەست لێبەرنەدراوە شتێك بەناوی شۆرشەوە نامێنێت. ئەزموونەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە سەرووشیانەوە ئەوانەی لە یەکێتی سۆڤیەت و چین پیادەکران، ئەو راستییە پشتڕاست دەکەنەوە.
پەیوەندی جاکۆبینیزم بە لیبڕالیزمەوە زۆر ئاشکراترە. جاکۆبینیزم وەك رەوتێکی تیرۆریستی شۆڕشگێری لیبڕالیزم رۆڵا دەبینێت. واتە باڵی رادیکاڵی لیبڕالیزمە. پێویستە لیبڕالیزم وەك هەشت پێیەك ببینرێت؛ نەك تەنیا بە قۆڵێك، بەڵکو بە چەندین قۆڵەوە دەجولێتەوە. تێڕوانینی جیهانی کاسۆلیك و بزووتنەوەی کۆمینالیستی دیموکرات دوو بزووتنەوەن کە لیبرالیزم لە خۆیانەوە ناگرێت.
تێڕوانینی لیبڕاڵا کە ئایدیالیزم و ماتریالیزمی سۆبژەکتیف و ئۆبژەکتیفی گۆڕیوەتە ئایدیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست بەکاردێنێت، هەژموونگەراییەکی ئایدیۆلۆژییە کە شیکارکردنی زۆر زەحمەتە. کاتێك لە ئەنارشیستەکانی خاوەن رادیکاڵترین بۆچوون، تا جوڵانەوە رۆژانەییەکانی وەك فێمێنیست و ژینگەپارێزەکانی وەك تێڕوانینی زۆر جیاوازو شێوازی ژیان دەبینرێن لەناو مۆدێرنیتەی خۆیدا دەتوێنێتەوە، ئەو راستییە دەسەلمێنێت کە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبڕالیست یەکێك لەسەرچاوە راستەقینەکانی هێزی سەرمایەدارییە.
بەوشێوەیە باشتر روون دەبێتەوە کە پێویستە لەدایکبوونی تورکیای مۆدێرنی پەیوەست بەڕاستی جاکۆبینیزم و جیهانگیری سەرمایەداری شیکاربکرێن. لە بەرامبەر ئەو سەرمایەدارییەی لە ساڵانی"1870" دەربازی قۆناخی پاوانخوازی ئیمپریالیستی بوو، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەمیانەی کۆنفرانسی بەرلینی ساڵی"1878"دا زیاتر کەوتە قۆناخی پەرتەوازەبوونەوە. رەوتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، لەناوخۆ و دەرەوە دەزگا کۆنەکانی ئیمپراتۆریەتی باویان دەهەژاند. تەدبیرەکانی ریفۆرمیش کاریگەر نەبوون. رزگارکردنی ئیمپراتۆریەت ئامانجی سەرەکی بوو. ئەو رەوتەی بە بزاڤی جۆن تورك ناونرابوون، رەنگدانەوەی باڵێکی ئەو رەوتە بوو کە لە ئەوروپا بە پێشەنگایەتی مازنی سەریهەڵدابوو. وەك باڵی نەتەوەپەرستی جاکۆبینیزم شێوەی گرتبوو.
یەکێك لەو مەیلانەش رەوتی ئیتیحاد و تەرەقییە کە دەشێت وەك میللیگەرایی عوسمانیش هەڵسەنگێنرێت و لایەنە تایبەتەکانی سەرنج راکێشە. تایبەتمەندی یەکەم، رەوتێك یان جولانەوەیەکە خۆی لەناو دەوڵەتدا رێکخستووە نەك ناو کۆمەڵگا. دووەمین تایبەتمەندی گرنگی، هەر لەسەرەتاوە بەشێوەی نەتەوەپەرستی دەوڵەت خۆی رێکخستووە. سێیەمین تایبەتمەندی، بەدەستی دەوڵەتەوە وەرچەرخانی سیستەمی بەشێوەی سەرمایەداریو بۆرژوازی بەخۆوە بینیوە. ئەو سێ تایبەتمەندیانە، کارەکتەری جاکۆبینیزمی راستڕەوی فاشیستیانەی ئیتیحادو تەرەقی ئاشکرا دەکەن. لەکاتێکدا کە نازیزمی ئەلمانیا و فاشیزمی ئیتالیاش وەك بزووتنەوەیەکی جەماوەری دەستیان پێکرد و دواتر بەشێوەی دەوڵەت خۆیان ڕێکخست، بەڵام بەهەموو شتێکیەوە ئاوابوونی ئیتیحاد و تەرەقی لەناو دەوڵەتدا، کارەکتەری هەرە کۆنەپەرستی جاکۆبینیزم، تەنانەت لەراستیدا کارەکتەری فاشیستیانەی پیشاندەدات کە لە جاکۆبەنیەت دەرکەوتووە. لەبەرئەوەی وەك دەوڵەتێکی هاوتەریب لەناو دەوڵەتدا خۆی رێکخستووە، خەسڵەتی رێکخستنێك دەخاتە روو کە بە دەگمەن دەبینرێت. بەگوێرەی دەوڵەتی باو، وەك دەوڵەتێکی پێشکەوتووخواز سەرهەڵنادات، بەڵکو وەك نیشانەی لەدایکبوونی دەوڵەتێکی فاشیست دێتە ئاراوە. بەو دۆخەیەوە یەکەمینەو دیاردەیەکی نموونەیە. لەخۆڕانییە کە دواتر هیتلەریش وەك مۆدێلێك بەبنەمای دەگرێت. یەکەمین مۆدێلی دەوڵەتە لەناو دەوڵەتدا.
لەوەش سەرنجڕاکێشتر، لەناو دەوڵەتدا بەدەستی دەوڵەت، نەتەوەپەرستی ئاوا دەکات. وێڕای ئەوەی کە هەر چوار دامەزرێنەرە یەکەمینەکەی ئەو رێکخستنە بەرەچەڵەك تورکیش نین، بەڵام هەنگاونانیان بۆ ئاواکردنی نەتەوەی پرۆتۆ ـ تورك، هەواڵدەری سەرەتای سەختگیربوونی کێشەی دیموکراسییە. ئەو دەوڵەت و نەتەوە هاوتەریبەی ئاوایانکردووە، هەر لەسەرتاوە پێچەوانەی دەوڵەتی باوو راستینەی سۆسیۆلۆژییە. بەتەواوی گریمانەییە. بەو شێوەیە تایبەتمەندێتیەکی دیکەی دیاری کارەکتەری فاشیزم، دەرەدەکەوێتە مەیدان. کاتێك لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، کۆمەڵەکە هەنگاو بۆ کۆمیتەگەرایی دەهاوێژێت، بەجۆرێك لەجۆرەکان مانای شەڕی ناوخۆیە. دەشێت دەستپێکردنی شەڕی ناوخۆ لەناو دەوڵەتدا بۆ سەرهەڵدانی کۆمیتەی چەکداری ساڵی"1906" بگەڕێندرێتەوە. بەڕێوەچوونی شەڕی ناوخۆ لەناو دەوڵەتدا، نموونەیەکی سەرنجڕاکێشە زۆر بە دەگمەن هاوتاکەی دەبینرێت. ئەو هەنگاوە کە دواتر دەبێتە مۆدێلێکی کودەتاکردن تەنانەت دەرفەت بە دیموکراسیەکانی شێوازی ئەوروپاش نادات.
بەکارهێنانی دەوڵەتی فەرمی لەلایەن نوخبەی نافەرمیەوە، مانای زۆرترین بنپێکردنی بنەماکانی دیموکراتیزەبوون دێت. لەوە خراپتریش بێناوەڕۆککردنی دەوڵەتە. سیفەتی هەرە بەرچاوی دەوڵەت فەرمیەتەکەی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایە لەرێگای یاسا دەستنیشانکراوەکانەوە. وێڕای هەموو کەموکورتیەکانیشی، نەریتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت لەلایەن سوڵتانە عوسمانیەکانەوە زۆر لەبەرچاوانە. هەرچەندە کارەکتەرێکی ئایینیشی هەبێت بەڵام خاوەن یاساو ئەخلاقی تایبەت بەخۆیان بوون. پەنابردن بۆ

تەکتیکێکی پیلانگێڕانە زۆر دەگمەن بوو، ئەویش لەئەنجامی هەندێك رەفتاری شەخسیەوە دەهاتە ئاراوە. شێوازی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و کۆمەڵگا لەلایەن ئیتیحاد و تەرەقی، لەسەرەتاوە هەتا دوایی کارەکتەری پیلانگێڕی و کودەتابوو. دەرکەوتن لە راستی دەوڵەتبوون گوزارە لەم راستییە دەکات. لەکاتی بەشداریکردن لە یەکەمین شەڕی جیهانیشدا ئەو راستییە بە هەموو رووتیەکەیەوە دەستبەکارە. کاتێك لەقووڵاییدا سەیر بکرێت، لە راستیدا دەبینرێت کە لەمیانەی گومڕاترین و فاشیستانەترین رێبازەکانی جاکۆبینیزمەوە دەوڵەت رزگار ناکرێت. بە پێچەوانەوە لەناو دەبرێت. چەتەگەرایەتی دەوڵەت، مانای لەناوبردنی دەوڵەتە. وێڕای نیازپاکیەکەشیان بەڵام مەشرووتیەتی یەکەم و دووەم بەپێچەوانەی ئامانجەکانیان کۆمەکی نامەشروتیەت، دەوڵەتی چەتەگەرو چەمکی بێدەوڵەتیان کردووە. چەتەگەرێتی بیرۆکراتی دەوڵەتی نوێی زۆر لە دەوڵەتی کۆن خراپتر کردووە.
ئەو شکستەی فاشیزمی ئەلمانی لە ساڵی"1945"دا دووچاری هات، لە ساڵی1918 فاشیزمی ئیتیحاد و تەرەقی بەناوی تورکێتی تووشی هات. بە شێوەیەکی تریش نەدەبوو. زۆر پێشتر دەوڵەت بەهۆی چەتەگەرێتی ناوخۆ دووچاری شکست هاتبوو. لەساڵی"1918" لەئەنادۆلی ناوین و میزۆپۆتامیادا نەك تەنیا دەوڵەت، بەڵکو کۆمەڵگاش رووبەڕووی داگیرکاریەکی ئاشکرا ببوویەوە. قەیرانی دەوڵەت و دیموکراسی لە قووڵترین دۆخی خۆیدابوو. لەبەرامبەر ئەمەدا، ئامرازەکانی دیکەی دەوڵەت و هێزەکانی کۆمەڵگاش جگە لە دیفاعی نەفس و دەربازبوون بۆ دۆخی بەرگری رەوا هیچ چارەیەکی تریان نەبوو. ئاشکرایە کە لەبەرامبەر ئەو تابلۆیەدا رێبەرایەتی مستەفا کەمال تایبەتمەندێتیەکی جاکۆبەن وەبیر مرۆڤ دێنیتەوە. داگیرکەری ئاشکرا هەنگاو بەهەنگاو پێشدەکەوێت. لەمێژە نوخبەی بەڕێوەبەرایەتی نەریتی رێککەوتنی لەگەڵا هێزە بیانیەکان کردووە. پێگەی رێبەرایەتی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیش جێگای باس نییە کە زۆر لاواز بوو. ئەوەی دەمێنێتەوە چانسی چینی ناوینی زۆر رادیکاڵا و رێکخراوە، کە بەناوی هەموو کۆمەڵگاوە بکەوێتە جموجۆڵەوە. مستەفا کەمال هەم شێوازی پێگەیشتنی کەسایەتیەکەی، هەم بەهۆی هۆشیاری و ئیرادەشەوە پڕ بە پێستی ئەو هەلومەرجانەو کەشتیەوانی دۆخەکە بوو. هەروەها شارەزایی باشی بۆ زمانی فەرەنسی، ئاسانکاری بۆ تێگەیشتنی فەرەنسای کۆماری سێیەمین کردووە کە پرەنسیپەکانی جاکۆبینیزمی پەسەندکردووە، زۆر بە باشی لە کۆمارگەرێتی جاکۆبەن تێگەیشتووە. لەلایەنی رێکخستنیشەوە پێگەکەی گرنگە. هەم دۆخی بەرهەڵستکاری لەبەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی ئیتیحادو تەرەقی، هەم لەکاتی پەرتەوازەبوونی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە یەکگرتنی لەگەڵا گرووپەکەیدا کۆمەکێکی گەورەی پێشکەش بە چانسی رێبەرایەتی جاکۆبی کردووە. ئەوەی دەمێنێتەوە هەنگاونانە بۆ پێگەی رێبەرایەتی کردنی کرداری.
ئاشکرایە کە مستەفا کەمال لەساڵی"1919" چۆن دەستی بە رێبەرایەتی کرداری کردووە. لێرەدا سەرەکیترین پرسیاری زەقبکرێتەوە؛ چۆن توانی فەرماندارێتی داگیرکەری ئینگلیزو سوڵتان وەحدەدین دەرباز بکات. وەڵامی ئەو پرسیارە کە دەبێتە بابەتی زۆرێك لە گفتوگۆ ئالۆزەکان، لەگەڵا بە دەستەوەگرتنی رێبەرایەتی کرداری ئیتر گرنگی خۆی لەدەستدەدات. ئەو قۆناخەی ساڵی"1920" بەڕاگەیاندنی پەرلەمان دەستیپێکرد، لە راستیدا لە دژایەتیکردنی داگیرکەری زیاتر، گوزارشت لە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەکات. چۆنایەتی پەرلەمان و ئامانجەکانی ئەو راستییە دەسەلمێنێت. گرنگترین خاڵی پێویستە ئاماژەی پێبکرێت، ئەو هێزانەی لەم شۆڕشەدا رۆڵی سەرەکییان بینی هێزە پەرتەوازەکانی دەوڵەت نەبوون، بەڵکو هێزەکانی کۆمەڵگا بوون. ئەگەر هێزەکانی کۆمەڵگا پشتیوانیان نەکردبوایە ئەوا ئامرازە نەخۆش و تێکشکاوەکانی دەوڵەت، نەیاندەتوانی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بەڕێوەببەن. مستەفا کەمال کە زۆر باش دەرکی بەو رەوشە کردووە، مایەی تێگەیشتنە کاتێك بە پێداگریەوە پەرلەمان وەك تاکە سەرچاوەی رەوابوون نیشاندەدات. هەرچەندە لە ئاستێکی قووڵیشدا نەبێت، بەڵام لە هەلومەرجەکانی شۆڕش تێگەیشتووە. نوێنەرایەتی زۆربەی هێزەکانی کۆمەڵگا دەکات. خەسڵەتی دیموکراتیانەی یەکەمین پەرلەمان ئاشکرایە. لەمیانەی بونیادە ئایینی، نەتەوەیی و چینایەتیەکەیەوە پێگەی سنوورەکانی میساقی میللی روون دەکاتەوە کە بە بنەمای گرتووە. هەتا دوایی دژی داگیرکاری دەوەستێتەوە. کارەکتەری ئایینی کۆمەڵگا لە کارەکتەری میللی لەپێشترە. کوردو تورکە موسڵمانەکان هێزە سەرەکیەکانی کۆمەڵگان. دوژمنایەتی کۆمۆنیزم ناکات. لە رێگای شەخسی لینین دا دۆستایەتی لەگەڵا ئەنتەرناسیۆنالیزمی کۆمۆنیستدا دەکات. مۆرکی چینی ناوینی پێوەیە. بەشێکی زۆری بیرۆکراسی و ئەشرافیش سەر بەو چینەن، ئەو بزووتنەوەیە وەك رێگەچارەی کێشەکانی مان و نەمان دەبینن. ئەگەر هێشتا بەرجەستەتری بکەین، وەك ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستە تورکە عەلمانیەکانی چینی ناوین، رێبەرە کوردو تورکەکانی ئومەتگەرا ئیسلامیەکانی عەشیرەت و ئەشرافەکان لەگەڵ سۆسیالیستەکانی چینی ژێر کە هەواداری بەلشەفیك بوون ئەو هێزانە بوون کە لە پەرلەمانی تورکیادا رێککەوتبوون. هەرچەندە دیاریش نەبێت، ئەو رەوتە و نوێنەرایەتیەکانیان لە هەلومەرجی داگیرکەری ئاشکرادا، وەك هێزەکانی کۆمەڵگا کەوتوونەتە جموجۆڵا.
هەرچەندە رێبەرایەتی مستەفا کەمال پێویستی بە هەل بوو، بەڵام پەسەندکراوە. سەنگەرگرتنی ئەو هێزانەی کۆمەڵگا رێگای لە داگیرکردنی ئاشکرا گرتووە. ساڵەکانی "1920ـ 1924" قۆناخی شۆڕشە کە لایەنی توندوتیژی و سەربازی لەپێشە. وەك پرۆسەیەك جاکۆبەنێك بەسەرکەوتوویی تێپەڕیووە. ئەو قۆناخە دەرفەتێکی گرنگی لە لایەنی دیموکراتیزەبوونەوە رەخساندووە. لەگەڵا راگەیاندنی کۆمار لە ساڵی"1923"دا، ئەو دەرفەتە بەردەوام بووە. بەڵام لەرێگای دەستووری"1924"، زۆر کەوتنە دواوەی دەستووری"1921"، لەمیانەی هەڵبژاردنی"1923" فرەیی پەرلەمانی تورکیا سەرکوتکرا، هەروەها بەبیانووی سەرهەڵدانی کوردان لە"1925"دا

پەراوێزکردنی کوردان ئەو دەرفەتە مێژووییەی پێچەوانە کردۆتەوە، سیستەمی هەژموونگەرایی یەك پارتی وەك بژار پەیرەوکراوە.
ئێستاش بابەتێکی گرنگی گفتوگۆیە کە بۆچی و چۆن دەربازی ئەم قۆناخە بوونە. بەڵام وەك ئەنجام هێزو هۆکاری کوشتنی مستەفا سوبحی و کادیرە پێشەنگەکانی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا"TKP"، دوورخستنەوەی سەعید نورسی و محەمەد عاکف دوو کەسایەتییە گرنگەکەی بزووتنەوەی ئیسلامی لە ساڵی"1923"دا هەروەها پیلانگێری و ئاژاوەگێریەکانی لە سەرهەڵدانی کوردان لە ساڵی "1925"دا روویدا، هەر چییەك و کێ دەبێت، کێشە نییە، بەشێوەیەکی ئاشکرا دەیسەلمێنێت کە رێکەوتنی دیموکراتی تێکچووە و قۆناخی هەژموونگەرایی بەبنەما گیراوە. لە هەڵسەنگاندنی قۆناخی هەژموونگەراییدا بەرپرسیارگرتنی مستەفا کەمال رێگا لەپشتگوێخستنی هۆکارە سەرەکیەکان دەکاتەوە. لە ئاستی پێویستدا مستەفا کەمال رۆڵی مێژوویی خۆی لە رووبەڕووبوونەوەی داگیرکاری و راگەیاندنی کۆمار بینیوە. بەڵام نەیتوانیوە رێکەوتنی دیموکراتیانەی کۆمار بپارێزێت و رێگا لە هەڵوەشانەوەی بگرێت. لێرەدا هۆکارە ناوخۆیی و دەرەکیەکان کاریگەریەکەی زۆر لە رۆڵی کەسایەتیەکان زیاتر بووە. لەناوخۆدا وروژاندنی یاخیبوونی کوردان و بەکرێگیراوەکانی سەڵتەنەت، رۆڵێکی گرنگییان لە پەراوێزکردنی کوردان بینیوە. لەکاتێکدا لەو دەنگدانە شاراوەی کە لە ساڵی"1922" لە پەرلەمانی تورکیادا ئەنجامدراوە، بە"373" دەنگی ئەرێ و بەدژایەتی "63"دەنگ، بڕیاری دامەزراندنی ئەنجوومەنێك پەسەندکرا کە خۆبەڕێوەبردنی کوردان بە بنەما دەگرێت. لە سەرەتای ساڵی"1924"دا، لە خودی ئەو لێدوانانەی مستەفا کەمال خۆی رایگەیاندوون، باسی پرۆژەیەکی چارەسەری کردووە کە مانای خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتی کوردان دەبەخشێت.
پەراوێزکردنی کوردان لە بڕیارێکی نەخشە بۆ کێشراوی ئەتنیکی مستەفا کەمال زیاتر، پەیوەندی بەو ئاژاوەگێڕیانەوە هەیە کە بەریتانیا لەگەڵ لایەنگرانی سەڵتەنتدا نایانەوە تا سەرباری میساقی میللیشەوە موسڵ و کەرکوك لەدەرەوەی سنوور بهێڵرێنەوە. بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەمە کراوە: لەبەرامبەر موسڵ و کەرکوك ـ وەك ئەوەی لەبەرامبەر رۆم و ئەرمەنیەکان ئەنجامدراوە ـ رێکەوتنێکی لەناوبردنیان کردووە. بۆچی کۆمار لەبەرامبەر ئەو تەعویزانەی بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی داویەتی کە لە بەرامبەریدا شەڕی سەربەخۆیی بەڕێوەبردبوو، کوردی خستۆتە دەرەوەی سیستەم؟ ئەمەش لە هەڵەیەکی مێژوویی زیاتر، پەیوەندی بە بژارێکەوە هەیە. لەو بڕوایەدان کە ئیتر پێویستی بە رێکەوتن لەگەڵ کوردان نەماوە. هەروەها لە پشتیوانیکردنی ئینگلیز بۆ کوردانیش دەترسن. ئەو رێکەوتنەی کە پێی گەیشتوون، لەو پەیماننامانە دەچێت کە لەگەڵ یۆنان، رووس و فەرەنسیەکان بەستوویانە. لەو دۆخەدا یەکێك لەو هەنگاوە گرنگە دژە دیموکراتییانەی لە یەکەمین ساڵانی دامەزراندنی کۆماردا هاوێشتراوە، سەبارەت بە کوردە. ئەنجامەکەشی تا رۆژی ئەمڕۆمان ناسۆری مەزن، زیانی مادی و پاشەکشێی بەردەوامی کۆمارە بە لایەنی دژە دیموکراسیدا.
تێکچوونی رێکەوتن لەگەڵ ئومەتگەرای ئیسلامیش دووەمین هەنگاوی گرنگی دژە ـ دیموکراتییە. هەرچەندە لەژێر ناوی عەلمانیەتدا، بەردەوام کامپینێکی ئایدیۆلۆژی و پراکتیکی لە بەرامبەر ئومەتی ئیسلام بەڕێوە بچێت و کێشەکەش بەشێوەی کۆنەپەرستی ـ پێشکەوتنخوازی پیشانبدرێت، بەڵام ئەوەی پەیرەو دەکرێت بژاری هەژموونگەرایی سیستەمە. کەمەندکێشکردنی چەمکی ئوممەتی ئیسلامی زاڵ بۆ ژێر هەژموونگەرایی، هەڵمەتێکی نەخشە بۆکێشراوی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو کە هەنگاویان بۆ هاوێشتبوو. لە سەردەمی هەموویانەوە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا، رۆڵی هێزەکانی ئەوروپا لەمەدا لەپێشەو گرنگە. بژارەکە بەگوێرەی ئەرێکردنیان پەیرەوکراوە. لە ناوەوەو لە دەرەوە دابڕانی کۆماری تورکیای نوێ لە ئومەتی ئیسلام، وەك ئامانجێکی ستراتیژی دانراوەو لەو چوارچێوەیەشدا هەڵوێستیان پیشانداوە.
هەر لە سەرەتاوە هەوڵدراوە نوێنەری چینی کرێکاران لەدەرەوەی سیستەم بهێڵرێنەوە. نەك تەنیا کۆمەڵکوژی مستەفا سوبحی و هەڤاڵانی، بەڵکو قەدەخکردن و گرتنی بەردەوامیان سەرچاوەی لە بژاری بەدەرنان لەسیستەم وەردەگرت.
هەژموونگەرایی بۆرژوازییەك جێگای باسە کە دەیانویست خۆیان لە ژێر باڵی پاراستنی کۆماردا پێکبێنن. بابەتی گفتوگۆکردن بوو. لەرێگای بەکارهێنانی هاوپەیمانە ستراتیژیەکانیان، مۆڵەتی دەسەڵاتدارێتیەکی ژێر هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان وەرگرتووە. دەوڵەتێکی نوێ جێگای باسە کە لە کاتی راگەیاندنی کۆمار لەکۆنگرەی ئابووری ئەزمیر، بەشێوەیەکی ئاشکرا بژاری خۆی بەلای سەرمایەداریدا نیشانداوە، لەمیانەی شۆڕشە مەدەنیەکانەوە بژاری خۆی بۆ مۆدێرنیتە خستۆتە روو، هەروەها هاوپەیمانەکانی فڕێداوەتە دەرەوەی سیستەم و بەشێوەیەکی ئاشکرا بژاری خۆی بە لایەنی شارستانی رۆژئاوادا پیشانداوە. لێرەدا لە کەسایەتی مستەفا کەمال زیاتر، دەستەواژەکانی ماوەی کۆنژەکتەرو بونیادی دیاریکەرن. ژیانداریکردنی کۆماری راگەیەنراو، بەدۆستایەتیکردنی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیادا دەرباز دەبوو. هەرچەندە هاوپەیمانێتیەکی دۆستایەتی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی مۆسکۆش هەبێت، بەڵام دۆستایەتییە سەرەکیەکەی لەگەڵ بەرەی بەریتانیادا بووە.
ئەمە ئەو واقیعەیە کە مۆرکی خۆی لە سیاسەتی دەرەوەی مستەفا کەمالیشداوە. کاتێك واقیعبینی مستەفا کەمال بێنینە بەرچاو، ئەوا تێگەیشتنی رووداوەکان زەحمەت نییە. ئاشکرایە کە کۆمار تەنیا لەمیانەی رێکەوتن لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا دەیتوانی بژیت و بەردەوام بێت. قەوارەیەکی سیاسی جێگای باسە کە بەتەواوی لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیای ئەو کاتە تەبایە. رێگا دراوە کۆمار ببێتە دەوڵەت ـ نەتەوەیەك، لەبەرامبەر ئەمەشدا کورد، ئیسلام و سۆسیالیستەکان بەدەرنراون. ئەگەر ئەو رێکەوتنە لەگەڵ سیاسەتی بەریتانیا نەبوایە، کۆمار

هاوپەیمانە سەرەکیەکانی خۆی پشتگوێ نەدەخست. ئاراستەی ئەو قۆناخە بەرەو رژێمە فاشیست، سەرەڕۆو کۆنژەکتۆرەکان کاریگەری لەسەر بژاری دەوڵەت ـ نەتەوە هەبووە. بەتایبەتیش دوای ساڵانی"1930" ئەو بژارە بەرچاوترە. ماوەیەکی درێژ بژاری کۆمار بەلایەنی شارستانیەتی رۆژئاوادا بووە. هەرگیز بژاری سۆڤیەت و سەرلەنوێ گەڕانەوە بەرەو شارستانیەتی ئیسلامی نەخراوەتە رۆژەڤەوە.
لە کۆماری تورکیادا، بەڕێوەبردنی دەوڵەت ـ نەتەوە بە نەتەوەپەرستیەکی بێسنوور، لەهەر جۆرە هەنگاوێکی دیموکراتی گرنگتر بینراوە. بەپێچەوانەی مەزەندەکان، لەو ئەزموونەدا مستەفا کەمال لە پێشی پێشەوە نییە. ئەزموونی "فرقەی سەربەست" لە ساڵانی "1930"دا، پەیوەستبووني قووڵی بە لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە سۆمەر و هیتیتیەکانەوە، پیشانیدەدات کە نەژادپەرست نەبووە بەڵکو دیموکرات بووەو بە پشتبەستن بە دەوڵەمەندی کلتووری ئەنادۆڵ لێگەڕینی بۆ وڵاتپارێزی بووە. بەردەوامکردنی بەرنامەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەهەموو زێدەڕۆیی و خێراییەکەیەوە گرێدراوی هێزی نەریتی ئیتیحادگەراکانە. لە دەرەوەی مستەفا کەمال کەسێکی تر نەبوو لەبەرامبەر ئەو نەریتەدا تێکۆشان بکات. بەپێچەوانەوە زۆربەی زۆری بیرۆکراسیەتی سوپا و مەدەنیش لە سەرووی هەمووشیانەوە عیسمەت ئینۆنو، فەوزی چەکماك و کازم قەرەبەکر، ریشەکەیان ئیتیحادو تەرەقییە، شوێنکەوتووی وشکی ئەو نەریتە باوەبوون. تاکە گۆڕانکاری ئەوەبوو لە لایەنگیریکردنی ئەلمانیاوە ببوون بە لایەنگری ئینگلیزەکان. ئەو بوویەرانەی دوای هەوڵە تیرۆرکارییەکەی ئەزمیر هاتنەئاراوە، پیشاندەدات کە مستەفا کەمال لەژێر گۆشەگیریەکی تەواودایە. مستەفا کەمالی دوای ساڵانی "1926 ـ 1927"، لەناو چەرخ و فەلەکی بیرۆکراسیەت لە چانقایەدا کلیل دراوە. کاتێك دەڵێم حوکمی کەسەکان نییە بەڵکو حوکمی کۆنژەکتۆر پێڕەو دەکرێت، هەوڵدراوە جەخت لەسەر گرنگی ئەو راستییە بکرێتەوە. پێویستە بە گرنگییەوە ئەو خاڵەش رەچاو بکەین کە تاوەکو لەساڵی 1948 ئیسرائیل دامەزرێنرا بزووتنەوەی زایۆنیزمی سەر بە ئیمپراتۆریەتی بریتانیا تورکیای نوێی وەك وڵاتی دایك بۆ یەهودیەکان پێشنیار دەکرد.
بەکورتی تا مردنی مستەفا کەمال، قۆناخی کۆمار لەمیانەی ئایدیۆلۆژیاو کردەوە زێدەڕۆییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەو نەریتی وشکی ئیتیحادگەرایی لەناو بونیادێکی هەژموونگەرایی ودژ ـ دیموکراتیدا بووە. سەرەڕای ئەوەی ئەولەویەتی پێدراوە، بەڵام پەرەسەندنی سەرمایەداری دەوڵەتی و پیشەسازیگەرایی سنووردارماوە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە بە شارستانیەتی رۆژئاوای هاوچەرخ ناودەبرێت، تەنیا لەژێر سایەی رژێمێکی سەرەڕۆی تاك پارتی درێژەی بە هەژموونگەرایی خۆیداوە. کێشەی دیموکراسیش چەندەی بڵێی سەختبووە. دوای شەڕی جیهانی دووەم گرێدراو بە هەڵکشانی هێزی هەژموونگەرایی نوێی سیستەم ئەمریکاوە، لەگەڵ دەرکەوتنی پارتی دیموکرات "DP"لەساڵانی"1945 ـ 1950"دا تەقینەوەیەکی بەخۆوە بینی. ئەوەی لەرێگای پارتی دیموکراتەوە لەسەر سیستەم زیادبووە، بەشێکی ئەشرافەکانی دەوروبەری ئیسلامییە. ئەو رووداوەی لە عەلمانیەتدا بە دواکەوتن ناودەبرێت، لەناوەڕۆکدا کەمبوونەوەی بەشی بۆرژوازی بیرۆکراتییە لە قازانج و داهاتی دەوڵەتدا. تێکۆشانی قازانجخوازی لەرێگای عەلمانیەتەوە بەڕێوە دەچێت.
چەپی سەرکوتکراویش لەو قۆناخەدا هەوڵی جموجۆلکردن دەدات. جولانەوەی کوردیش لەناو هەنگاو هاوێشتنێکی زۆر لاوازتردایە. لە کاتێکدا سێ جولانەوە دیموکراتیەکەی فاشیزمی ئیتیحادگەرایی سەرکوتی کردبوون بەنۆرە هەوڵی زیندووبوونەوەی دەدەن، کۆماری تورکیاش کە دەبێتە ئەندامی ناتۆی ژێر هەژموونگەرایی ئەمریکا، لەپاسەوانێتی ئینگلتەراوە دەربازی ژێر پاسەوانێتی ئەمریکا دەبێت. ئەمریکاش ئەو پاسەوانێتییە لەرێگای رێکخستنی گلادیۆوە ئەنجامدەدات. لەماوەی نێوان ساڵانی"1950 ـ 2007"دا سەرجەم بونیادە سەربازی ـ سیاسیەکان لەژێر چاودێری گلادیۆدا کاردەکات. تێگەیشتنی ئەو راستییەی کە جگە لە قۆناخی جاکۆبانیکی ساڵانی "1920 ـ 1922"دا، تەواوی سەردەمەکانی دیکە لەژێر کۆنترۆڵی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە پێشکەوتووە، سەبارەت بە کێشەی دیموکراسی گرنگە. سەربەخۆیی خەیاڵێکی بۆرژوازی بچووکەو پەیوەندی بەو راستیەوە نییە. لە سیستەمێکدا کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەژموونگەرایی جیهانی خۆی تێدا زاڵکردووە، هیچ وڵات و دەوڵەتێك سەربەخۆنین. بەهۆی تایبەتبوونی ئەنادۆڵەوە کۆماری تورکیا، دەوڵەتێکە بە زۆرترین تۆڕەکانی پابەندبوون بە سیستەم گرێدراوە.
رێکخراوی گلادیۆ کە دوای شەڕی سارد گرنگی نەماوە، لەبەرهۆکاری "PKK"هەتا ساڵی"2007" کاریگەریەکەی لەتورکیا بەردەوام دەبێت. گلادیۆی ناتۆ لەژێر ناوی جیاجیاوە کاروبارەکانی خۆی لە تورکیا بەڕێوەدەبات، تەنانەت چانس بە دیموکراسیەتێکی بۆرژوازیش نادات. لەکاتێکدا کۆماری تورکیا لەماوەی نێوان ساڵانی"1925ـ 1990"دا، تا هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت رۆڵی دژە ـ سۆڤیەتی دەبینی، دوای ساڵانی"1990" هەوڵدەدرێت وەك وڵاتێکي مۆدێل و نموونە لە مۆدێرنکردنی ئیسلامدا بەکاربهێنرێت. بونیادی کۆمیتەگەرا ـ کودەتاچی ناو دەوڵەت رۆڵێکی گەورەی لەو داخوازییەی خۆ بەکارهێنانی کۆماری تورکیادا هەیە. بەکارهێنانی هێزە جیاوازەکان لە بەرامبەر یەکتری، ئەو دەرفەتە دەرەخسێنێت. شەڕی چەتەگەرێتی لەناو دەوڵەتدا، زۆر لە مەزەندەکان زیاتر کێشە کۆمەڵایەتیەکان سەختگیرتر دەکات. ئەگەری هەر بزووتنەوەیەکی دیموکراتی بە کۆتایی خۆی دادەنێت، تەنانەت بچووکترین جموجۆڵی دیموکراتیش سەرکوت دەکات.
مانای کۆماری تورکیا بۆ شارستانیەتی رۆژئاوا سنووردارە بە کۆمەککردن بە ئاسایشەکەی و پێشکەشکردنی بازاڕو دەستی کاری هەرزان بۆ ئابوورییەکەی. شەڕی کۆماری تورکیا لەگەڵ"PKK" ، تەنیا بە ئاشکراکردنی ئەو سیاسەتەی سیستەم نەوەستا،، بەڵکو ئەوەشی سەلماند کە ناکۆکی "PKK"لەگەڵ سیستەمدایە. هەروەها ئەوەشی روون کردەوە کە لەیەکتری جیاکردنەوەی کوردو تورك نابێتە ئامانج. کاتێك بۆ یەکەمین جار بەمجۆرە

راستیەکانی سیستەمی دەسەڵاتدار ئاشکرابوو تێکۆشانی دیموکراسی راستەقینەی تورکیاش شێوەیەکی رادیکالانەی بەخۆیەوە بینی. تێگەیشتنی ئەو راستییە گرنگە کە شەڕی "PKK"لەگەڵ کۆمار نییە، بەڵکو دژی ئەو ئانتی دیموکراسیەتەیە کە لەئارادایە. لە بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەك، دەرکەوتن لە تەنگەژەی دەوڵەتۆچکە ـ نەتەوەیەك، مانای دیموکراتیزەبوونێکی جێگیر دەبەخشێت. ئەمەش بەو واتایە دێت کە کێشەی سەختی دیموکراسی کەوتۆتە قۆناخی چارەسەرییەوە.
ئەنجام، هەوڵی تیرەکانی ئۆغوز لەسەدەی یازدەهەدا بۆ چارەسەرکردنی کێشە زۆرەکانیان لەمیانەی هەنگاونان بەرەو ئیسلام سەرەتای کێشەکانی دیموکراتیزەبوونی تورکیای ئەمڕۆ پێکدێنن. لەکاتێکداپلەدارەکان"هیرارشی"ی سەرووی تیرەکان، لەرێگای دەوڵەتبوون هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانیان دەدەن، توێژە هەژارەکانی ژێرەوەش بەناوی تورکمانێتی لە رۆژهەڵاتی ناوین بڵاوبوونەوە، هەوڵیاندەدا بەردەوامی بەشێوە ژیانی سەرەتایی و دیموکراسی سروشتی خۆیان بدەن. لەکاتێکدا تایبەتمەندی ئەتنیکی چینی سەروو، لە ناو کلتووری عەرەب و فارسدا دەتوێتەوە، تیرە تورکمانەکانیش تایبەتمەندییە ئەتنیکیەکانیان تا رۆژی ئەمڕۆ گواستۆتەوە. ئەرستۆکراتی تیرەکان وەك بەڕێوەبەرانی دەوڵەت و فەرماندارانی سوپا شوێنی خۆیان لە شارستانیەتی ناوەندیدا گرت، تورکمانەکانیش هەرچەندە ژیانی شێوازی کۆنیان لەپێشتر بێت، بەڵام بەشداری ژیانی نیمچە ـ جێگیریش بوون. زیاتریش لەگەڵ خەڵکە جێنشینەکە گونجاون. لەکاتێکدا رژێمی سەردەمی سەلجوقی و ئاتابەگەکان، و سەردەمی عوسمانیەکاندا، بەشێوەی شارستانیەتی هاوبەشی ئارستۆکراتیەتی فیودالی پێشکەوت، دۆخی تێکەڵی گەلانیش، وەك رەوشێکی سروشتی ژیان بەردەوامبوو.
باب و باپیرانی تورك و کوردانی ئەمڕۆ، هەرچەندە هەندێك ناکۆکیش لەنێوانیاندا هەبێت، بەڵام ئاگاداری ئەو راستیەشن کە پەیوەندی ستراتیژی نێوانیان رۆڵێکی ژیانی دەبینێت. وەك دەزانرێت لە سەدەی"11" لە کردنەوەی دەروازەکانی ئەنادۆڵ بۆ تیرەکانی ئۆغوزو شەڕکردن لە دژی سوپای خاچپەرستەکان، هەردوو گەل لەناو ستراتیژیەتێکی هاوبەشدا دەجولێنەوە. ئەو پەیوەندییە ستراتیژیەی کە میرنشینە کوردو تورکەکانی تێپەڕاندو لەچوارچێوەی قەومدا پێشکەوت، تەنیا لەدژی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتیی نەبوو، هەروەها بەرامبەر خاچپەرستەکانیش سنووردار نەبوو، بەڵکو لە دژی سوڵتان، پاشایەتی و میرنشینە عەرەبەکانیش بەهەمانشێوە بوو. بۆ جاری یەکەم پێکهێنانی ئەیالەتی کوردستان لە سەردەمی سەلجوقیەکاندا، ئەو راستییە دەسەلمێنێت. ئەوەی لە خانەدانی ئەیوبیەکاندا سەرنجراکێشترە ئەو پەیوەندییە لەسەردەمی ئارتووك ئۆغوڵلاری، قەرەقۆینلەرو ئاق قۆینلەریشدا بەردەوام دەبێت. ئەو کێشانەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەکاتی پەلهاوێشتنی بەرەو ئێران، عەرەبستان و قەفقاسیا رووبەرووی بوویەوە، دوای سەرقاڵبوونێکی زۆری دیبلۆماسیانەی ئیدریسی بەتلیسی، لەرێگای یەکێتی لەگەڵ میرنشینە کوردیەکان دەرباز دەکرێت. بەمجۆرە ئیمپراتۆریەت دوو هێندە گەورە دەبێت. رێکەوتنی ستراتیژی لەو قۆناخەدا ئاشکراترە. ئاسیمیلاسیۆنی سروشتی لەنێوان دوو کۆمەڵگادا روویداوەو تایبەتمەندی هاوبەشی کلتووری هاتۆتە ئاراوە. تورکمانە بە رەچەڵەك کوردو کوردە بە رەچەڵەك تورکمانەکان زیادیان کردووە.
دزەکردنی مۆدێرنیتەی ئەوروپا بۆ کلتووری رۆژهەڵاتی ناوین کە لە سەرەتاکانی سەدەی"19"لەرێگای ناپلیۆنەوە بوو بە هەڵمەتێکی ستراتیژی، کردەوەکانی داگیرکەری و چەوسانەوە کە لە پەرەسەندندابوو، لە قووڵاییدا ئەو هاوسەنگیانەی هەژاندووەو گۆڕانی بەسەردا هێناوە. شێوازی ژیان وکلتووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە پێشوەخت لەناو گەلانی کریستیانیدا پێشکەوت، مەیلەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی گەرمترکردووە. مۆدێرنیتەی سەدەی "19 و 20" لەرێگای فاکتەری دەوڵەت ـ نەتەوەوە کلتووری رۆژهەڵاتی ناوینی پارچەکرد کە خاوەن یەکێتیەکی هەزاران ساڵە بوو، بەمجۆرەش رێگای لە بەردەم ئاڵۆزی، قەیران و شەڕی گەورە کردەوە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش لە پرۆژەی دەوڵەت ـ نەتەوەی رۆژئاوا، پارچەبوو و رووخا. جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقیش بە ئامانجی ئاواکردنی دەوڵەت لەناو دەوڵەتدا رۆڵی کۆمیتەگەرایی بینی، لە ساڵی"1906"دا هەنگاوی بۆ کۆمیتەی چەکداری هاوێشت و قەیرانە راستەقینەکەی دەوڵەتی قووڵتر کردۆتەوە. بەناوی بەربەستکردنی مەیلی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتە، بەرەو ئاواکردنی نەتەوەپەرستیەکی هەرە کۆنەپەرست، شۆڤێن و فاشیست هەنگاوی ناوە. رەوتی تورکێتی کە زۆربەی ئەندامەکانی تورك نەبوون، هۆکاری سەرەکی رووخانی ئیمپراتۆریەت، ئازارەکانی پرۆسەی کۆمارو دژە ـ دیموکراتی و بنبەستبوونی بوون. ئەوەندەی دەوڵەت ـ نەتەوە نەیارەکان رۆڵیان لە پارچەبوون و بنبەستبووندا هەبوو.
کاتێك مستەفا کەمال لە ساڵانی 1919ـ1922 لەرێگای شۆڕشی جاکۆبینیزمەوە چەمك، تیۆری و دامەزراوەکانی سێیەمین کۆماری فەرەنسای پراکتیزە کرد کە وەك مۆدێل هەڵبژاردبوو، ئەگەر سنووردارییش بێت توانی ببێتە چارەسەری قەیرانی دەوڵەت. کۆماری تورکیا، لەسەر ئەو وێرانەیەی ئیمپراتۆریەت دامەزرا کە قووڵکردنەوەی قەیرانی لەلایەن کۆمیتەگەرایی ئیتیحادو تەرەقی بەرەو پارچەبوون و رووخاندنی برد. تا رادەیەك کێشەکانی دەوڵەت چارەسەر بوون، بەڵام کێشەکانی کۆمەڵگا قووڵتر بوونەوە. پرۆژەی کۆمار پرۆژەیەکی مۆدێرنیتەتە بوو. لەمیانەی ئەرێکردنی هێزەکانی رۆژئاوا لە لۆزان هەوڵی جێبەجێکردنی درا. شۆڕشی جاکۆبەنی ساڵانی"1920 ـ 1922"، دەیتوانی تەنیا لەرێگای کۆمارەوە خۆی بە دەربازکردنی قەیرانەکانی دەوڵەت سنووردار نەکات. ئەگەر هێزە هاوپەیمانەکانی نەتەوەپەرستە تورکە عەلمانییەکان، سۆسیالیستەکان، ئوممەتگەرا ئیسلامی و نوێنەرەکانی کۆمەڵگای کوردی، بە گەلەکۆمە و ئاژاوەگێرییەکی نهێنی و شاراوە

لەدەرەوەی کۆمار نەهێشترابوونایەوە، بە دڵنیاییەوە لەوانەیە کۆمار بەرەو دیموکراسی ئاراستەی گرتبوایە. چونکە هەرچۆنێکیش بێت سەرکەوتن بە رێکەوتنی ئەو هێزانە بەدیهاتبوو. بە گەلەکۆمەو ئاژاوەگێری بەڕێوەدەچوو، پەیوەست نەکردنی بە مستەفا کەمالەوە، بۆ لێتوێژینەوەیەکی راست گرنگە. چونکە گەلەکۆمە، هەوڵی تیرۆرکردن و ئاژاوەگێری لەبەرامبەر مستەفا کەمالیش بەڕێوە چوون. لێرەدا رۆڵی بەرچاو هی کادیرە ئیتیحادگەراکانە کە مستەفا کەمالیشیان ئابلۆقە دابوو. پارتی گەلی کۆماری "CHP"بەناو گۆڕاوە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا شێوەی نوێی پارتی ئیتیحادو تەرەقی وەرگرتووە. مستەفا کەمال لەرێگای ئەزموونی فرقەی سەربەست لە"1930"دا هەوڵی شکاندنی قۆرخکاری"CHP" ی داوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە. دوای ساڵی"1935 "CHP" "بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بەرنامەو پەیرەوی ناوخۆی پارتی فاشیستی ئیتالیای بۆ خۆی وەك مۆدێلێك پەسەندکردووە، رووبەڕووی کاردانەوەی ئاشکرای مستەفا کەمال بۆتەوە.
پێویستە بە گرنگیەوە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت: ئەوەی دوای ساڵی"1926" لەپێشە سەنگی کەسایەتی مستەفا کەمال نییە، بەڵکو ئەزموونەکانی کادیرانی ئیتیحادگەرایە کە هەنگاو بە هەنگاو دەستدەگرن بەسەر کۆمارو دامەزراوەکانی زهنیەتی فاشیستانەی سەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوەی زێدەڕۆ. هەڵوێستە ئاشکراکانی مستەفا کەمال سەبارەت بە دوورخستنەوەی سوپا لە سیاسەت، دامەزراندنی دەوڵەتی یاسا، رەتکردنەوەی بنەماکانی گروپخوازی و چینایەتی و سیاسەتی ئازادی و سەربەخۆخوازی لە بەرامبەر دەرەوە لەلایەن ئەو کادیرانەی کە ئابلۆقەیان دابوو بە گەلەکۆمە و سیاسەتی ئیمتیازخوازی مایەپووچکراوەتەوەو ئەو سیاسەتەش لەرێگای کودەتاکانەوە هەتا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. ئەوەی شایەنی باسە، ئەزموونەکانی بەردەوامکردنی نەریتی کودەتاکانی ناو کۆشکە، کەکودەتا و گەلەکۆمەی ئیتیحادگەراکان، دەوڵەت لە ناوەڕۆکی خۆی دەردەخەن، دەستی بەسەردا دەگرن و درێژە بە نەریتی بەڕێوەبەرایەتی زۆرداری سەر کۆمەڵگا دەدەن. لەبەرامبەر ئەمەشدا تێکۆشانێکی هێژاش جێگای باسە کە بە ئامانجی بەردەوامبوونی ناوەڕۆکی دەوڵەت بەراستیش بۆ ئەوەی دەوڵەت وەك دەوڵەت بەردەوامبێت، زۆر بەڕێوەچوون. ئاواکردنی کۆمار لەلایەن مستەفا کەمالەوە لەسەرووی ئەو هەوڵانەوە دێت.
ئەو دوو چەمکەی لە قۆناخی مۆدێرنیتەی رۆژئاوادا، بەردەوام لەناو شەڕو ململانێدابوون، هەروەکو چۆن هەمیشە دەوڵەتی لەناو قەیراندا هێشتۆتەوە، کۆمەڵگاشی رووبەڕووی کێشەی سەخت کردۆتەوە، پەیرەوکردنی دیموکراسیەتێکی جێگیری بەربەست کردووە. کۆمار نەیتوانیوە خۆی دۆخی سەرچاوەی بەرژەوەندیخوازی پاوانی ئۆلیگارشی جیاکاری و کودەتاکان رزگاربکات، بەراستیش نەیتوانیوە ببێتە دەوڵەتێکی عەلمانی، کۆمەڵایەتی، دیموکراتی و یاسا. بێگومان هۆکاری سەرەکی ئەمەش پووچەڵکردنەوەی رێکەوتنە دیموکراتیەکەی کۆمەڵگای سەرەتای ساڵانی"1920" و هەوڵی هەژموونگەرایی پاوانە کودەتاچی، ئیمتیازگەرو ئۆلیگارشییەکان بوو. ئەو تێکۆشان و هەوڵانەی لەناو دەوڵەت دەدران، هیچ پەیوەندییەکی بە دەستەواژەکانی یاسا، دەوڵەتی کۆمەڵایەتی، عەلمانی و دیموکراتەوە نەبوو، بەڵکو لەپێناو بەدەستخستنی داهات و قازانجە گەورەکانی دەسەڵاتدارێتییە.
بە درێژایی مێژووی کۆمار دەتوانین ئەو سەردەمە بۆ سێ قۆناخ جیابکەینەوە. قۆناخی یەکەم کە ساڵانی "1926 ـ 1950"، لەخۆوە دەگرێت، دەتوانین وەك ئۆلیگارشی بیرۆکراتیکی دەستڕۆیی یەك پارتی وەسفی بکەین. قۆناخی دووەمیش، ساڵانی"1950 ـ 1980" لەخۆوە دەگرێت، سەردەمی شەڕو کودەتا دژوارەکانە بۆ سەرلەنوێ دابەشکردنی قازانجی دەوڵەت لە نێوان خاوەن زەویەکان، بە ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك ببنە خاوەن بەش، بۆرژوازی بازرگانی و خاوەن پیشەکانی کە دەیانەوێت لەگەڵ ئۆلیگارشی بیروکراتیکدا ببنە شەریك. قۆناخی سێیەمیش، ساڵانی"1980 ـ 2010" لەخۆوە دەگرێت، ئەو قۆناخەی کە بەدەستێوەردانی راستەوخۆی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری، بەشداریکردن لە قازانجی دەوڵەت بەرچاو دەبێت. تایبەتمەندی هاوبەشی نێوان هەرسێ قۆناخەکە؛ شانبەشانی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە ئۆلیگارشییە توندڕەوانەی پاوانەکانی سەرمایەی دەوڵەت و تایبەت لەسەر چین و توێژەکانی گەل و کۆمەڵگا ئاوایانکردووە، سەرتاسەر بە شەڕی ئەو پارت و سەندیکایانە تێپەڕی کە بە ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی دەوڵەت ئاوایانکردبوو. ئەو هێزە هەژموونگەرایەی لەدەرەوە ئەو قۆناخە کۆنترۆڵ دەکەن، لە بنەڕەتدا لەماوەی نێوان "1925 ـ 1945" ئیمپراتۆریەتی بەریتانیایە، لە ماوەی نێوان"1945 ـ 2010"ش ئەمریکایە. دوای ساڵانی"1950" تا رادەیەك یەکێتی ئەوروپا، "IMF"سندوقی نێودەوڵەتی دراوو بانکی جیهانیش بوونەتە شەریکی پرۆسەکە. بەڕێوەبەری سەرەکیش گلادیۆی ناتۆیە.
هەرچی هێزە هاوپەیمانەکانی دامەزراندنی کۆماریشن، لەبەرامبەر ئەو هەژمونگەراییەی لەبەرامبەریان بەڕێوەدەچێت، بەشێوەیەکی سروشتی لە دۆخی بەرخودان دابوونە. هەرچەندە لەیەکتری داپڕاوو بڵاویش بن، بەڵام لە هەرسێ قۆناخەکەشدا ئاشنای بەرخودان یاخود هەوڵدانی ئەو هێزانە بۆ یەکبوون لەگەڵا سیستەمدا دەبینین. روسیای سۆڤیەت و هێزە سۆسیالیست و کۆمۆنیستە هاوپەیمانەکانی یەکەمین هێز بوون کە لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانەوە زەبریان بەرکەوت، سەرکوتکران و بوون بە قوربانی. قۆناخی لەناوبردن کە بە کوشتنی مستەفا سوبحیەوە دەستیپێکرد، بەداخستنی پارتی کۆمۆنیست لە ساڵی"1927"و دەستگیرکردنی حیکمەت کفلجملی و نازم حیکمەتیش قووڵکراوەتەوە. دوای ساڵی"1950" وەك بەهانەیەکی ئەندامبوون لە ناتۆ دەسگیرکردن و سەرکوتکردن تۆختر کراوەتەوە. هەرچەندە سۆسیالیستەکان لە ئاکامی کودەتای بیرۆکراتی"27 ئایاری 1960"دا دەرفەتیان بۆ رەخساو ویستییان خۆیان بدۆزنەوەو هەنگاوی دیموکراتییانە بهاوێژن، بەڵام بە کودەتای"12 ئاداری 1971" دووبارە سەرکوتکرانەوە. هەرچەندە تا"1980" کان

هەوڵی درێژەدان بە بەرخودانەکەیان دابێت، بەڵام بە کودەتای ساڵی"1980" پشتیان شکاوەو تا رۆژی ئەمڕۆمان نەهاتوونەتەوە هۆش خۆیان. تا ئێستاش خۆیان وەك رێکخراوێکی دیموکراتی رادیکاڵانەی یەکگرتوو فرەلایەن رێکنەخستووەو بەشێوەیەکی بڵاو، بێبەرپرسیارو زۆر لاواز هەوڵدەن درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. ئەوانیش بەگوێرەی پۆتانسێلەکەیان ئەو ئەرکەیان لەسەرشانە کە هەنگاوی چالاك و دیموکراتییانە بهاوێژن.

ئومەتگەرا ئیسلامیەکانیش لەبەرامبەر ئەو زەبر، دەستگیرکردن و دوورخستنەوانەی دووچاری هاتن، بە بەرخودانێکی کەمتر، بەڵام بەکۆکردنەوەیەکی کاردانەوەیەکی زیاتر لە ناخیاندا رووبەڕووی بوونەتەوە. ئەو بەرخودانە رۆشنبیریەی لە ساڵانی نێوان"1923 ـ 1950"دا لەکەسایەتی محەمەد عاکیف، سەعیدی نورسی و نەجیب فازل بەڕێوەچووە، هەوڵەکانی مۆدێرنیزەکردنی ئیسلام بوو. بەواتایەکی تر رێبەرایەتییان بۆ برایەتی موسڵمانێتی تورکیا و بەرخودانی ئەو ئیسلامیەتە کردووە کە سەرلەنوێ شرۆڤەکراوەتەوە. لە نێوان ساڵانی "1950 ـ 1980"دا هەم لەناوخۆو هەم لە دەرەوە، پەیوەندییان لەگەڵ هەندێك هێزی باڵادەستی هەژموونگەرا پێشخستووەو بوونەتە شەریکی دەسەڵاتدارێتی و قازانجی دەوڵەت، لەڕێگای سەرمایەداری تایبەتەوە پرۆسەی بوون بە پاوانی سەرمایەیان دەستپێکردووە. جولانەوەی ئەربەکان، جولانەوەی ئیسلامی نموونەیی ئەوکاتە. گوزارشت لە بەرژەوەندی و حەسرەتی چەندین رەوت دەکات سەبارەت بە نوێنەرایەتیکردنی دەسەڵات. جولانەوەی سەعید نورسی کە وەك نورانیەت بەردەوام دەبێت، لەژێرەوەو بەشێوەی چەند باڵێك بەردەوام دەبێت. نەقشبەندێتی سەدەی نۆزدەهەم پاشخانی مێژوویی هەموویان پێکدێنێت. سەرەڕای ئەوەی سیستەمێکی دیموکراتی سنوورداریان لەگەڵ خۆیاندا پێشخستووە، بەڵام نەبوونەتە خاوەن هەڵوێستێکی دیموکراتییانەی بەبڕیارو سیستەماتیك. هەرچەندە لەنێوان ساڵانی"1980 ـ 2010" لەکەسایەتی تورگووت ئۆزاڵ چەترێکی پاراستنیان بۆ خۆیان پەیداش کردبێت، بەڵام لە قۆناخی دەسەڵاتدارێتی و سەرمایەداریدا، بەردەوام لەلایەن ئۆلیگارشی بیرۆکراتیکدا لەژێر هەڕەشەدابوونە. بەتایبەتیش لە رێگای ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵا ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، IMF، بانکی جیهانی و هەندێك ناوەندی سەرمایەی عەرەبییان پێشخستووە، کردوونیەتی بە شەریکی سیستەم، دوای ماوەی کورتخایەنی سەرۆك وەزیرایەتی ئەربەقان، پێشەنگایەتی و سەرۆك وەزیرایەتی ئەردۆغان دوای ساڵی2000، ئەو هاوبەشیەتیە هەمیشەییتر بووە.

ئەو هێزانە رووبەرووی کێشەیەکی قورسی دیموکراتیزەبوونن. لەبەرامبەر ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك بەردەوام خۆیان لەژێر هەڕەشدا دەبینن. یان لەرێگای هەڵمەتێکی تەواوی دیموکراتیزەبوون ئەو هەڕەشانە دەرباز دەکەن، ئەگەر ئەو هەڵمەتەش ئەنجام نەدرێت، ئەوا لەرێگای ئەو زەبرو پارچەبوونە هاوشێوەی دووچاری چەپ هات ئەوانیش ـــ دادگایکردنی ئەرگەنەکۆنیش گوزارە لەو راستیە دەکات ـــ پێگەی ئێستایان لەدەستدەدەن.

ئەو هێزانەی لە بەرامبەر ئۆلیگارشی بیرۆکراتیك خاوەن پێگەی هەرە هەستیارو تراژیدیە کوردە، کە لە سەردەمی دامەزراندنی کۆماردا هێزێکی هاوپەیمان بوو. وێڕای ئەوەی ئەندامێکی بنەڕەتی کۆمارن و شەڕی رزگارین بەڵام ئەو رەوشەی کوردی تێخراوە زۆر تاریکەو گرێدراوی چەندین گەلەکۆمە، ئاژاوەگێڕی و تەرحیلە. هەمان ئەو سیاسەتەی کە پێشتر بە ئامانجی پاککردنەوەی ئەنادۆڵا لە رۆم و ئەرمەنیەکان پەیرەو کرابوو، لەماوەی نێوان ساڵانی"1925 ـ 1950" بەسەر کوردانیشیاندا سەپاندو سیاسەتی قەڵاچۆکردنی کوردانیشیان بەڕێوەبرد، قۆناخی سەرهەلدانەکانی "1925 ـ 1938"یش پەیوەندی بەو سیاسەتانەوە هەیە. رۆڵی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا لێرەدا، هەمان ئەو رۆڵەیە کە لە لەناوبردنی رۆم، ئەرمەن و ئاشووریاکاندا بینی. ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئیمپراتۆربەتی بریتانیادا بەستوویەتی رۆڵی دیاریکەری هەیە لە پاشەکشێکردنی شێوەی کۆمار بۆ رژێمێکی سەرەرۆو گرێدانی بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە. دەتوانین بڵێین ململانێیەکی زۆر توند لەنێوان کایرەکانی ژێر کۆنترۆڵی مستەفا کەمال و عیسمەت ئینۆنۆدا هەیە، راکێشانی کۆمار بۆ هێڵی راستڕەوی و دژە ـ دیموکراتی رۆڵی لەمەدا بینیوە، هەروەها لەکاتێکدا کە مستەفا کەمال دۆستی سۆڤێتە و سەربەخۆخوازە، لایەنەکەی تریش پەیوەندیەکی هەمەلایەنی لەگەڵا ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا هەبوو.

دوای سەرهەلدانەکان وەك ئەوەی کێشەی کورد کۆتایی هاتووە تەماشاکراوە. تەنانەت جوولەیەکی زۆر بچووکیش وەك زیندیبوونەوەی مردووەکە شرۆڤە کراوەو یەکسەر سەرکوتکراوە. ماوەی نێوان"1950 ـ 1980" کێشەی هەرە گەورەی کوردان، بەسەلماندنی بوونی خۆی گوزەری کردووە. سەرجەم بەرخودان و گفتوگۆکان لە دەوروبەری پرسیاری " کورد هەیە یان نا؟" پێشکەوتووە. دەرکەوتنی "PKK" لەسەر بنەمای دەربازکردنی ئەو گفتوگۆیەو دەستپێکردنی قۆناخی رزگاری، بابەتیانە بەناوی هەموو ئۆپۆزیسیۆن بۆتە هێزی سەرەکی ماوەی نێوان "1980 ـ 2010". لەو قۆناخەدا لە ئاکامی کودەتای "12ی ئەیلولی 1980" کێشەکانی دیموکراتیزەبوون زۆر سەختبوون، پێشێلکردنی مافی مرۆڤ ئاستێکی جیهانی وەرگرتووەو چەتەگەرێتی لەناو دەوڵەتدا باڵادەست بووە، بە کشاندنەوەی پشتگیری ئەمریکا بۆ بزووتنەوەی ئەرگەنەکۆن ئەنجامگیربوو کە سەرلەنوێ وەك گلادیۆی تورك خۆی رێکدەخستەوە. ئەو رێکەوتنەی لە تشرینی دووەمی"2007" لەنێوان ئەمریکاو کۆماری تورکیا هاتە ئاراوە، لەبەرامبەر لەناوبردنی "PKK"گلادیۆی تورك لەناو ببرێت، ئەو ئەندامانەش کە بەرگری دەکەن دادگایی بکرێن، ئەوانی دیکەش لە چوارچێوەی دەزگاکانی سیستەمی دەوڵەت جێگیر بکرێن. تەواو لەو خاڵەدا، بووینە شاهێدحاڵی گەورەترین گفتوگۆی مێژووی کۆماری تورکیا لەبارەی دیموکراتیزەبوون و وەرچەرخانی کۆمار بۆ کۆمارێکی دەستوری دیموکراتی.

چۆنیەتی دەرکەوتن لەناو گەورەترین قەیرانی مێژووی کۆمار کە تا رۆژی ئەمڕۆمان بە هەموو خێراییەکەیەوە لەناو دەوڵەت و کۆمەڵگادا بەردەوامە، لەمیانەی هەڵوێستی ئەو هێزانەی لە ئارادان دیاردەبێت. گفتوگۆو لێگەڕینەکانی

دەستوورێکی دیموکراتی، هەم هۆکار هەمیش ئەنجامی ئەو قەیرانەیە. ئەوەی راستییێت هەردووکیان لەناو دینامیزمێکی چالاکدان کە یەکتری دەئافرێنن. لەم رەوشەشدا دیسان کێشەی کورد لە سەرووی مەسەلەکەدایە. لە بنەڕەتدا ئەو راستییە پەیوەندی بە پرەنسیپێکی قووڵی مێژووەوە هەیە؛ هەرگیز کێشە کۆمەڵایەتیەکان بە توندوتیژی سەرکوت ناکرێت، هەر کاتێك دەرفەت ببینێت بە شێوەیەکی دژوارتر سەرهەڵدەداتەوە. لەو لایەنەوە قۆناخی"1920 ـ 1925"یش قۆناخێکی زۆر سەرنجراکێش وەك بڵێی سەرلەنوێ لەشێوەی بازنەیەك دووبارە دەبێتەوە. بەڵام ئەمجارە هەموو هاوپەیمانەکانی دامەزراندان نەك بۆ سەرکوتکردن، بەڵکو لەوانەیە بۆ سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆماری دیموکراتی بانگێشت بکرێن کە لەکاتی خۆیدا ئەنجامنەدرابوو. شرۆڤەکردنی ئەو هێڵە باریکەی نێوان مێژوو و ئەمڕۆکە وەك خۆ دووبارەکردنەوەیەك بەڕێوەدەچێت، دەرفەت و چانسی تێگەیشتنی ئەو راستییەو بینینی رۆڵی مێژوویی دەرەخسێنێت.

ب ـ دەرکەوتن لە قەیران و رێگەچارەی دەستوری دیموکراتیانە

رێکەوتنێکی نادیار لەنێوان گشت لایەنەکانی کۆمەڵگا سەبارەت بە دیموکراتیزەکردنی تورکیا پێکهاتووە. ئەوەی نابینرێت، ئەو داخوازییە نادیارو مێژوویيە بۆ ئیرادەیەکی زیندوو ناگۆڕێت. دەستووری دیموکراتیش گوزارشت لەحەقیقەتی ئەو راستییەو ناوەڕۆکەکەی دەکات. بەشی دووەمی ئەم هەڵسەنگاندنە، بەتایبەتیش لە بەشی پرەنسیپەکان، چوارچێوەی ئەو دەستوورە دیموکراتییە پێشکەش دەکات کە وەڵامی داواکارییە دیرۆکیەکانی دیموکراتیزەبوون دەداتەوە. بەشێوەیەکی زۆر کورت و گەوهەری دەتوانین گوزارە لەو پرەنسیپانە بکەین کە پشت بە چەمك و دەستەواژەی زانستی دەبەستێت، لەسەر بنەمای دەرکەوتن لە قەیران و دەستوورێکی دیموکراتییانە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی کۆمار دەکاتە ئامانج.

1ـ نەتەوەی دیموکرات: پێناسەی نەتەوەی دیموکراتیك کە لە هەر کلتوور، ئەتنیك و ئایینێك( چەمکی ناسنامەی نەرم و سەرکراوە بێت) وەو تاکانە پێکدێت کە هاوبەشێتی لە ماف و ئازادییە بنەڕەتیەکان دەکەن، هەروەها پشت بە بنەمای لێکدانەبڕانی مافەکانی تاك و جڤات دەبەستێت، لەگەڵ پێناسەی وڵاتی هاوبەش دەگونجێت، خاوەن کارەکتەرێکی ئەوتۆیە کە بەرفراوانترین یەکێتی بەدیدێت.

2ـ نیشتمانی هاوبەش"وڵاتی دیموکراتی": ئەو شوێنەی ناکرێتە موڵکی ئەتنیکێك یان گروپێکی ئایینی، هەروەها بێ ئەوەی چەمکی ئەویتر پێشبخرێت، کۆمەڵگای ژینگەپارێز، ئابووری و دیموکرات و تاکە ئازادەکانی وەك هاوڵاتی دیموکراتیك تێیدا بژین، نیشتیمانی هاوبەشی پێدەڵێن. ئەم پێناسەیە بەتەنیا بۆ خۆی خاوەنی ماناو دەوڵەمەندیەکە دەتوانێت یەکێتیەکی فراوان پێك بێنێت.

3ـ کۆماری دیموکراتی: پێویستە کۆمەڵگای دیموکراتیك بە بنەما بگرێت کە فاکتەری دیاریکەری کارەکتەری عەلمانی، حقوقی و کۆمەڵایەتی دەوڵەتە. کۆمار شێوەی نموونەیی دەوڵەتی ئەو کۆمەڵگایەیە کە دیموکراسیەتی تێدا بەڕێوەدەچێت. لەکۆمارێکی بەمجۆرەدا تایبەتمەندی عەلمانیەت، کۆمەڵایەتی و حقوقی وەك دەرەنجامێك دێتە ئاراوە.

4ـ چارەسەری دیموکراتی: بەیەکەوەبوونی ئاشتیانەی دەزگاکانی کۆمارو دەزگاکانی کۆمەڵگای دیموکراتی بنەمای چارەسەری دیموکراتیانەیە. لەچوارچێوەی ئەو پێناسەیەدا، پاوانەکانی دەوڵەت ــ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی ناچارن لەگەڵ دامودەزگاکانی کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی، کۆمینالیزمی ئابووری و ژینگەپارێزی، کۆمەڵگای دیموکراتی ژیانێکی ئاشتیخوازانەی پشتبەستوو بە رێککەوتن پەسەند بکەن. ئاشکرایە دەوڵەتێکی بێ دیموکراتی چەندە رەدبکرێتەوە، دیموکراسیەتێکی بێ دەوڵەتیش ناسەپێندرێت.

5ـ لێکجیانەبوونەوەی مافەکانی تاك و جڤات"هاوبەش": کۆمەڵگاکان بەو رادەیەی بوونێکی کۆلەکتیفن، ئەوەندەش تاکەکەسن، هێندەی تاکەکەسن ئەوەندەش کۆلەکتیفن. لەیەکتری جیاکردنەوەیان چەنەبازی و درۆیەکی لیبرالیزمە، ئامانجیشی چەوسانەوەو سەرکوتکردنە. بەربەستکردنی ئەو یارییە، تەنیا لەمیانەی بەیەکەوە ژیانی مافەکانی تاك و جڤات بە شێوەی گۆشت و نینۆك بەدیدێت.

6ـ سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و ئازادی: بە گشتی تا هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیی شارستانیەتی چینایەتی، بەتایبەتیش هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەربازنەکرێت، چارەسەرکردنی کێشەکانی دیموکراتیزەبوون سەقەت و ناتەواو دەبێت. بەتایبەتی لەرێگای پۆزیتیڤیزمی ئەوروپاوە زەحمەتە شیکارێکی ئازادانە دەرهەق بە کلتووری رۆژهەڵاتی ناوین ئەنجامبدرێت و بە رێگەچارەی دیموکراتییانە بگەیەنرێت. تەنیا ئەوانەی بە شێوەیەکی ئازادانە سروشتی کۆمەڵگای خۆیان و مێژووەکەی بە دەستەواژە، هزرو دامەزراوە بگەیەنن دەتوانن بەو شیکارو رێگە چارانە بگەن و ژیانی ئازاد بەرجەستە بکەن.

7ـ مێژوویبوون و هەنووکەییبوون: ئەوەندەی مێژوو هەلومەرجی ساتی ئێستا دیاردەکات، هەنووکەش مێژوو بەرجەستە دەکات. جیاوازی نێوانیان، دەرفەتی دەستێوەردانی ئێستا (هەنووکە) دەرەخسێنێت، واتە چانسی ئازادکردن پێشکەش دەکات. وەك چۆن مێژووی بێ هەنووکە بوونی نییە، هەنووکەی بێ مێژووش نابێت. هەوڵەکانی مۆدێرنیتە بۆ بێ مێژووکردن، بریتییە لە شەڕی فێرکردن و راکێشکردنی تاك و کۆمەڵگا بۆ ژێر چەوسانەوەو سەرکوتکردن کە لە رێگای بێ یادەوەریکردن، بێ ئەخلاق و بێ سیاسەتکردن ئەنجامدەدرێت، بۆیەش پێویستە بە تەواوی رەد بکرێتەوە.

8ـ ئەخلاق و ویژدان: لە شیکارکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا و بەدیهێنانی دیموکراتیزەبووندا، هەڵوێستە ئابووری و سیاسییەکان بەتەنیا بەش ناکەن. کۆمەڵگا وەك کەینونەیەك و بە درێژایی مێژووەکەیەوە بەردەوام بە شێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەخلاق و ویژدان ژیاوە. ئەو شەڕەی کە مۆدێرنیتە لەبەرامبەر ئەخلاق و ویژدانی کۆمەڵگا دەستیپێکردووە، ئامانجی رەواکردنی فشارو داگیرکەرییە، ئەو چارەسەرییە ئابووری و سیاسییانەی کە سەرچاوەی خۆیان لەو هەڵوێستە وەردەگرن، وەك چۆن لەناوەڕۆکدا دەرفەتی نییە، کێشە کۆمەڵایەتیەکان سەختردەکەن و هەوڵەکانی دیموکراتیزەبوون مایەپووچ دەکەن. لە رێگەچارەی دیموکراتییانەی کێشەکاندا مسۆگەر پێویستە پەنا ببرێتە بەر پرەنسیپی ئەخلاقی و ویژدانی کە شوێن بە پێوانەی هێز نادات.

9ـ بەرگری خۆیی دیموکراسیەکان: ئەوەیان دەستنیشانکردنێکی زانستییە کە نەك تەنیا گیانەوەرە زیندووەکان، بەڵکو ئەوانەی وەك بێ گیانیش ناو دەبرێن، لەهەر کات و شوێنێك، بەسیستەمی بەرگری خۆیی و گەوهەری خۆیان دەژین. لەو سۆنگەیەوە پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی ئازادو یەکسانە کە تاك، دامەزراوو کۆمەڵگا دیموکراتیەکان لەبەرامبەر فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم) خاوەن سیستەمێکی تەواوی بەرگری خۆیی بن.
لەکاتێکدا لەتورکیا بەرەو چارەسەرکردنی کێشەکانی دیموکراتیزەبوون و کورد هەنگاو داوێژین، لەو بڕوایەدام کە ئەو هەڵسەنگاندنە مێژووییانەو ئەو پرەنسیپانەی بە کورتی سەبارەت بە کۆماری دەستووری دیموکراتییانە دەستنیشانکراون، رۆشنکەرەوەو چارەسەر ئامێز بوون. لەسەر ئەو بنەمایە دەشێت کێشەی کورد بە ئاسانی لەناو یەکێتی دیموکراتییانەی تورکیا جێگیرو شیکار بکرێت، بەمجۆرەش مۆدێلێکی چارەسەری گونجاو یان ئەگەری مۆدێله ئەلتەرناتیفەکان پێشکەشبکرێت.

## بەشی چوارەم: کێشەی کورد و ئەگەرەکانی چارەسەری

لەوانەیە یەکەمین کێشەی کۆمەڵایەتی بە شارستانیەتی چینایەتییەوە دەستیپێکردووە پەیوەندی بە رەسەنایەتی کوردەوە هەبێت. ئەو قەومانەی لە سەردەمی هەڵکشانی شارستانیەتی سۆمەریدا، زۆر رووبەڕوومان دەبێتەوە قەومەکانی کورتی، هوری، گۆتی، ئارین کە ئاماژە بە سەرچاوە دەکەن. ئەو دەستەواژانە مانای "شاخی"،"خەڵکی شاخ" دەبەخشن، وەك دەزانرێت بۆ کوردەکانی ئەمڕۆش وەك ناونیشانێك دەگوترێت. شارستانیەتی سۆمەر وەك دژە تێزی کۆمەڵگای نیولیتیك پێشکەوت. بە گوتەیەکی تر، دۆڵەکانی دەشتایی میزۆپۆتامیای خواروو، دیجلە ـ فورات، لەبەرامبەر دۆڵە شاخاوی ـ بەرزاییەکان، واتە بەرامبەر بە میزۆپۆتامیای سەروو گوزارشت لە ئەلتەرناتیف دەکات. کێشەکانی کۆمەڵگای نیولیتیك گرێدراوی ئەو هەڵکشانەیە. بێگومان هاوتاکردنی کۆمەڵگای نیولیتیك و کوردایەتی رۆژی ئەمڕۆمان، باس و دەستنیشانکردنێکی زانستیانە نابێت. بەڵام ئەو لێکچوونەی نێوان میراسی زیندووی کۆمەڵگای نیولیتیك و کۆمەڵگای بەر لە"10000" ساڵ رێکەوت نییە. مێژووی کۆمەڵگا دەڵێت؛ پێویستە ئەڵقەکانی پەیوەندی نێوانیان بەهێزبێت. هەروەها شوێنەوارناسی"ئارکۆلۆژی"و زمانناسی"ئەتیمۆلۆژی" باسی بەهێزی ئەو لێکچوونەی

نێوانیان دەکەن. شیمانەیەکی بەهێزە کۆمەڵگای بنارەکانی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس، کارەکتەری کوردە بەراییەکانی هەبێت.
لە ساڵانی "5000" پ.ز تا سەردەمی بڵاوبوونەوەی ئیسلامیەت وەك چاخی یەکەمین ناودەبرێت. وەك دەزانرێت لە کۆمەڵگای ئەو سەردەمە دامودەزگا پەیوەندیدارەکانی شارستانی هەرەسئاسا گەشەیان کردووە، لەسەرووی هەمووشیانەوە پلەداری، خانەدان، دەوڵەت، شار، چین، بازرگانی، کشتوکاڵ، پیشەوەری، خێزان، ژن، کۆیلایەتی، ئایین، نووسین، زانست، وێژە، پەیکەرسازی، بیناسازی و بەرهەمەکانی پیشەسازی. ئەمجۆرە پێشکەوتنانەش مانای گەورەبوونی هەرەسئاسای کێشەکانی کۆمەڵگاش دەبەخشێت. کوردە بەراییەکانیش لەناوەندی ئەو کێشانەدان. وەك رێگا چارەی سەرەکیش پەنا دەبەنە بەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵ، بۆ رزگاربوون لە دوژمنەکانیشیان پشت بە لوتکە پیرۆزەکانی شاخ دەبەستن. ئەو دوو تایبەتمەندیە تەنانەت ئەمڕۆش هۆکاری سەرەکی هەبوونی کوردانن. لەکاتێکدا پلەدارێتی دەستڕۆیشتووی کوردە بەراییەکان، لەرێگای توانەوە لەناو شارستانیەتی دەوڵەتەکانی تەنیشتیان تواونەتەوە کێشە چینایەتی و کۆمەڵایەتیەکانیان چارسەرکردووە، جڤاتە رەنجدەرەکانیش لە دۆخی تیرەو خێڵە لە بەین نەچووەکانەوە کوێستان و گەرمیانیان دەکردو لەرێگای کشتوکاڵ و ئاژەڵداریەوە شەڕی مان و نەمانیان دەکرد. ئەوەی لەشاخدا ماوەتەوەو زیاتر بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداریەوە خەریك بووە کوردبووە " ئیستیسنا یاساکان خراپ ناکات". پیشەوەری و بازرگانی کردنی شارەکانیش بە گشتی پیشەی ئەرمەنی و سوریانیەکانی ئەمڕۆکە بووە. وەك بڵێی شێوەیەکی سروشتی کار دابەشکردن لە ئارادایە. گەلە رەسەن و سەرەکیەکانی دیجلە ـ فورات، بەدیالیکتیکێکی ژیانی بەمجۆرە پێکەوە گرێدراوبوون.
لەگەڵ هاتنی ئایینی کریستیانی ئەو گەلانە یەکەمین جیابوونەوەی گەورەیان بەخۆیانەوە بینی. پێشتریش یاهۆڤای خوداوەندی زاراوەیی ئیبراهیم، نوێنەرایەتی جیابوونەوەیەکی ریشەدارتری دەکرد. پێویستە هیچ کاتێك لەبیر نەکرێت کە ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی لەهەناوی شارستانیەتدا دەردەکەون، بەردەوام بەشێوەی خوداو ئایینی نوێ گوزارەیان لە خۆیان کردووە. چەندە دەستەواژەی ئایینی و خودایی ناکۆك پێکهاتوون، بەو رادەیەش کێشە کۆمەڵایەتیەکان گەورەو جۆراوجۆربوونە. لەکاتێکدا ئایینی زەردەشتی لە شاخەکانی زاگرۆس گوزارشت لە پیرۆزی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەکات، واتە گوزارشت لەخوداوەندایەتیەکەی دەکات، خوداوەندەکانی سۆمەر، بابل، ئەکەد و ئاشوریەکانیش نوێنەرایەتی شار، بازرگانی، دەوڵەت و خانەدانان دەکەن. بە ئاشکرا باسی ئەمە دەکەن. کاتێك بۆ یەکەمین جار کریستیانی وەك ئایینی چەوساوەو هەژارەکان شێوەیگرت، لەڕاستیدا دیسان بە زمان و ئایینی خوداوەند گوزارشت لە لێگەڕینی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان دەکات. کاتێك موسەویەت وەك ئایینی تیرە دەرکەوتووە، کریستیانیش وەك ئایینی خەڵك لە هەناویدا سەرهەڵدەدات. دەبێتە یەکەمین گەورە هەنگاوی ئومەتبوون و ئەکویمەنێتی. هەرچەندە محەمەدایەتی لەسەرەتای دەرکەوتنیدا گەل و ئومەتیش بەبنەمابگرێت، بەڵام لە سەردەمی سەڵتەنتدا چینی دەسەڵاتدار وەك ئایینی شارستانیەتی دەوڵەت هەژموونگەرایی خۆی ئاوا دەکات.
کوردایەتی چاخی ناوین" لە سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامیەت لەساڵانی 600وە تا ساڵانی 1800 کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاتە رۆژهەڵاتی ناوین" درێژە بە میراسی چاخی یەکەم دەدات. لەکاتێکدا چینەکانی سەروو، میر، بەگ، سەرکردەو شێخەکان لەگەڵا شارستانیەتی حوکمڕان (عەرەب، عەجەم و تورك) دەبنەیەك، لەبەرامبەر ئەمەشدا عەبا کوردیەکەیان فڕێدەدەن. ژیاندارکردنی کوردێتی بە سیفەتی پیاوی دەوڵەت لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان گونجاو نییە. بەرژەوەندیەکانیان ناچاریان دەکات ببن بە عەرەب، عەجەم و تورکێکی باش. بەمجۆرە کێشە کۆمەڵایەتیەکان بۆ کورد دوو هێندە زیادی کردووە. هەم وەك ناسنامەی سەرکوتکراو، هەم وەك ناسنامەی کلتووری خیانەت لێکراو کێشەکانی قووڵتر بۆتەوە.
ئایا کێشەکانی کوردان لە چاخی ناوین بە دەوڵەتبوون چارەسەردەبوو؟ لە سەردەمی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بیرۆکەیەکی بەمجۆرە دروستببوو. بیرۆکەی لەو جۆرە دادەهێنران گوایە ئەگەر گەل و ناسنامەکان ببن بەدەوڵەت، ئیتر کێشەکانیان بە چارەسەریەکی یەکجارەکی دەگات. لەبەر ئەوەی سۆسیالیزمیش لەگەڵا بەدەوڵەتبوونی پرۆلیتاریا هاوتا دەبینرا، پێویستە لەبەرامبەر بیرکردنەوەیەکی بەوشێوەیە واقی ورماو نەمێنین. ئاخی ئەوەمان هەڵدەکێشا بۆچی دەوڵەتێکمان نەبووە. کەچی لە راستیدا بیرۆکەی شارستانێتی دیموکراتی دەیسەلمێنێت کە دەوڵەتبوون سەرچاوەی هەموو نەخۆشییە گەورەکانە. شتێکی وەك دەوڵەتی عەرەب، عەجەم و تورکیش نەبوو. ئەوانە رەنگدانەوەی هەڵخەڵەتاندنەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بوو؛ بەتایبەتیش لە سەدەی دواییدا! دەوڵەتێکی هاوبەشی ئیسلامی هەبوو. هەندێك جار بەهۆی بەرژەوەندیەکانیان شەڕیش بکەن، بەڵام دەسەڵاتدارەکانیان لەناو یەکگرتندابوونە. هەروەها ئیسلام گەل و ئومەتی خۆی هەبوو. دونیاکەیان جیاببوویەوە. جیهانی کێشەکان بوو کە هەر گەورە دەبوو. دوو جەمسەری سەرەکی بەمجۆرە هەبوون. بە رادەی چارەسەرکردن کێشەکانیش هاوبەش بوون. بەناوی ئایین و خوداوەندەوە گوزارەیان لێدەکراو هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدرا. هەرچەندە کوردبوون، عەرەببوون، تورکبوون و فارسبوون وەك کلتوورێکیش هەبن، بەڵام کێشەکانیان لەمیانەی ئایین و ئایینزا هاوبەشەکانەوە باسدەکران. نە ئەمەوی و عەباسیەکان تەنیا بوونەتە دەوڵەتی عەرەبەکان، نە سەلجوقی و عوسمانیش تەنیا بوونەتە دەوڵەتی تورکەکان. نەریتی دەوڵەتی عەجەمەکانیش دەوڵەتی نەژادی نەبوو. لەکاتێکدا چینی سەرووی ئەتنیك و قەومەکان لەرێگای دەوڵەتبوون بوونی چینایەتی خۆی بەهێز دەکرد، هاورەچەڵەکەکانی دیکەی خۆشی فڕێدەدایە ناو زەلکاوی کێشە

کۆمەڵایەتیەکانەوە. کورد، ئەرمەنی، ئاشوری، رۆم، تورکمان، بەدەویەکان و ئەو عەجەمانەی نەبوونە دەوڵەتیش، ئەو راستینە کلتوورییانەن کەخراونەتە ناو گێژاوی کێشەکانەوە.
کاتێك مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە رێگای فاکتەرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی کەوتە رۆژهەڵاتی ناوین، بۆ ناسنامە سەبارەت بەو کلتوورو گەلانەی کە کلتوورەکەیان سەرکوتکراوە، چەوسێنراونەتەوەو داگیرکراون، لەچاخی ناوینیشدا هیلاك و داماڵراون، چیتر زەنگی مەرگ لێدەدات. ئەو گەلانەی لە مێژە دووچاری خیانەتی حوکمڕان و دەسەڵاتدارانی چینە باڵادەستەکانی خۆیان بوونەتەوە، وەك گۆڕەپانە نوێیەکانی راوکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوون. لەسەرەتای سەدەی"19" بەدواوە، سەرەتا بەناوی دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانەوە کەوتنە ململانێوە. لەگەڵا ئەوەشدا لە کارگەکانی سەرمایەداری و پیشەسازیگەراییدا کە لەپێناو قازانجی بێسنور هیچ کۆسپێك ناناسێت، لە ئاژەڵا خراپتر خرانە کارەوە. بۆ قازانج و سەرمایە وەرچەرخێنران. نامۆبوون بوو بە سێ قات. نامۆبوونی چاخی یەکەم، چاخی ناوین و چاخی نوێ.
وەك پێویستیەکی ئەو ناسیونالیزمەی بەسەر هەر کلتوورێکدا سەپێنراوە، کوردیش بەشی خۆی لەو ئافاتەدا وەرگرت، بگرە بە قورسترین شێوەش وەریگرت! دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکان بەسەرکەوتوویی ئەنجامگیر نەبوو. دیسان چینی سەروو بە شێوازێکی شایستەی میراسەکەی، جێگای خۆی لەناو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی دراوسێکاندا گرتووە، لەبەرامبەر ئەمەدا ناپاکیکردنی بە کلتووری نەریتی گەلەکەی بە رەوا دادەنا. ئەمانە بەهەڵوێستەکانی خوڵام لە پاشا پاشاترە بانگەشەی باشترین عەرەبێتی، عەجەمێتی و تورکێتییان دەکرد، لەو پێناوەشدا پێشبڕکێیان دەکرد. ئەوەندەی خیانەتیان لەبەرامبەر بەهای کلتووری و ناسنامە دەکرد، بەو رادەیە بەرژەوەندی، پارەو مووچەیان بە دەست دەهێنا. کوردانیش لەو پروایەدابوون لەمیانەی پشتبەستن بە دوو هۆکارە پیرۆزە هەزارانساڵیەکەی سەردەمی کوردە بەراییەکانەوە، واتە لەمیانەی پەنابردنە بەر شاخ، کشتوکاڵ و مێگەلە ئاژەڵەکانیانەوە لە بەرامبەر قڕکردندا دەتوانن بوونی خۆیان بپارێزن.

ا ـ دیالیکتیکی مێژووی پەیوەندی تورك ـ کورد

لە چوارچێوەی ئەو باسە گشتیەدا لە نزیکەوەو بە شێوەیەکی بەرجەستە هەڵسەنگاندنی پەیوەندی و ناکۆکیەکانی دوالیزمی کورد ـ تورك، کێشەکان و ئەگەرەکانی چارەسەری روونتر دەکاتەوە. لەناو گێژاوی توندوتیژیدا، نەکێشەکان و نە رێگاکانی چارەسەریش لەئاستی پێویستدا دەرکیان پێناکرێت. ئەگەر خودی رۆشنگەری و زانابوون نزیکی حەقیقەت بێت، واتە بە نیوەی چارەسەری گەیشتوون. نیوەکەی تریش، بەردەوامکردن و بڕینی رێگا کراوەکەیە بە هەنگاوی گونجاوەوە.
سەلجوقیەکان وەك بەگ و تیرەکان کاتێك گەیشتنە سنووری کوردستان "شیمانەیەکی مەزنە دەستەواژەی کوردستان لەکاتی گەیشتنی سوڵتانی سەلجوقی بە سنووری کلتووری کوردان ئەو ناوەی لێناوە" بەچەکی برایەتی ئیسلام پێشنیاری شەڕی هاوبەشیان لەبەرامبەر بێزەنتیەکان کرد. لەبەر ئەوەی بەشی زۆری کوردانیش ئیسلامیان پەسەندکردبوو و زۆرجار لە بەرامبەر بێزەنتیەکان تووشی گرژی هاتبوون، پشتیوانی ستراتیژی شەڕی هاوبەشیان کرد. سوڵتان ئالپ ئەرسەلان لە ئایاری "1071"دا لە مەیافارقین ی پایتەختی ئەو کاتەی کوردان دەژمێردرا"سیلوانی ئەمڕۆ" لەگەڵا بەگ و خێڵە کوردەکان لە هەوڵی رێکەوتندابوو. ئەو هێزەی کە هەم بەگەکان و هەم لەتیرەکان پێکهاتووە، شیمانە دەکرێت کە نیوەی لەکوردان پێکهاتبێت، بە سەرکەوتنی ئابی"1071" گەیاند کە بە خاڵی وەرچەرخان دەژمێردرێت. هەتا رۆڵی هێزی تیرەو بەگە کوردەکان لەو شەڕە راست شیکار نەکرێت، ئەوا پەیوەندی نێوان تیرەو بەگە کورد و تورکەکان، بەگوێرەی پێویست شیکار ناکرێت. سەرکەوتنەکە ستراتیژی بوو. چونکە تا دوایی دەرگای ئەنادۆڵای بۆ بەگ و تیرە تورکەکان ئاواڵا کرد. سەبارەت بە بەگ و تیرە کوردەکانیش کۆتایی بە هەڕەشەی بێزەنتیەکان و دەرەنجامەکانی دەهێنا. بەجێکردنی پەیوەندیەکان لەسەر بناخەیەکی بەمجۆرە، زۆر گرنگە و لە دیاریکردنی داهاتوودا رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت.
دواتر لەکاتێکدا تیرەو بەگە تورکەکان لە ئەنادۆڵ چڕبوونەوە، کە لەوێشەوە بەرەو ئەنادۆڵی ناوین و رۆژئاوای دەریای سپی و دەریای رەش بڵاوبوونەوە، تیرەو بەگە کوردەکانیش لە بەرەو پێشەوەبردنی شوێنی نیشتەجێبوونیان و هێزەکەیان دوا نەکەوتن. هیچ کاتێك تیرەو بەگە تورکەکان نایانویستووە دەست بەسەر شوێنی نفوزو نیشتەجێبوونی کورداندا بگرن و خاوەندارێتی لە نەریتی کلتووری ئەو شوێنانە بکەن. رێکەوتنی ستراتیژی نێوانیان، هاوکاری و کلتووری ژیانی هاوبەش، پێویستی بەمە دەکرد. لەم نێوەدا گەلانی ئەرمەنی و سوریانیش، لە شارەکان بە شێوەیەکی دۆستانە بەردەوامییان بە هەبوونی خۆیاندا. چونکە کێشەی مەزهەب لەنێوان ئەوان و بێزەنتیەکاندا هەبوو. دوورکەوتنەوەی بێزەنتیەکان لەهەرێمەکە لە زیانیاندا نەبوو.
لەو قۆناخەدا هەرچەندە بەناوی ئارتوکۆئۆغلولەر، قاراقۆیونلەر و ئاك قۆیونلەر هەندێك لە میرنشینی تورکەکان لەکوردستان ئاواکران، بەڵام تەمەنیان کورت بوو، ئەو تیرانە زیاتر بە توانەوەی سروشتی، لەناو کلتووری کورداندا توانەوە. تەنانەت لەرۆژی ئەمڕۆشماندا شوێنپەنجەی ئەو راستیپە دیارە. کوردانیش لە سەردەمی ئیسلامدا لەپاڵ چەندین میرنشینەوە بەشێوەی خێڵا و تیرە ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیان بەو کێشانەوە بەسەر برد کەتا دەچوو سەختتردەبوون. تایبەتمەندی قەومیان پێشدەکەوت. بەڵام هەر وەکو لە تیرە تورکەکان لەکاتێکدا چینی

سەروو لەژێر خزمەتی شارستانیەتی جۆراوجۆر میرنشینەکانی خۆیانیان پێشدەخست، چینی خوارووش وەك کرمانج "کوردمانج" بۆ پۆلێنێکی جیاوازتر جیادەبوونەوە. جیابوونەوەیەکی هاوشێوەی عەرەب ـ بەدەوی، تورك ـ تورکمان لەو سەردەمەدا لەناو کوردانیشدا خێراتردەبێت. تا سەردەمی سەڵتەنەتی عوسمانیەکان" هەتا نزیکی ساڵی 1500"دا، تیرەو بەگە کوردو تورکەکان، بەشێوەیەکی نادیار"زمنی"یش بێت رێزیان لە مافی یەکتری دەگرت، لەبەرامبەر هەرەشەکانی دەرەوە بۆ سەر هەردووکیان، جموجۆڵا و ستراتیژیەکی هاوبەش لە ئارادابوو. واتە لایەنی پەیوەندی ئەرێنی لە لایەنی ناکۆك و نەرێنی لەپێشترە. سەردەمێکی ناکۆکی و شەڕی بەسیستەم لەنێوانیاندا بەدیناکرێت.
دووەمین قۆناخی گرنگی ستراتیژی لە پەیوەندی نێوان کورد و تورکدا، بەکرانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەڕووی رۆژهەڵاتی ناویندا دەستپێدەکات. ئەو گرژیانەی لە سەرەتای سەدەی"16" لەنێوان میرنشینە کوردیەکان وخانەدانی سەفەوی لەئارادابوو کە لە ئێران لەسەر بنەمای مەزهەبی هەڵدەکشاو، لەمیانەی ناکۆکییە مەزهەبیەکان زیاتردەبوون و کاریگەریەکەیان لەسەر ئەنادۆڵیش تادەچوو زیاتر دەبوو. هەمان ناکۆکی لەگەڵ سوڵتانە مەمالیکەکانی تەوەرەی میسریش لە ئارادابوون. کاریگەری مەمالیکەکان لەسەر دەریای سپی و باشوری رۆژهەڵاتیش زیاد دەبوو. پێگەی میرنشینەکانی کورد رۆڵێکی ستراتیژی دەبینی. لەگەڵا کامە لایەن رێکبکەون، ئەو لایەنە دەبوو بە هێزی هەژموونگەرای رۆژهەڵاتی ناوین. هەڵوێستی یاوەز سەلیم لە رێکەوتنی ستراتیژی سوڵتانی عوسمانی سەبارەت بەو رێکەوتنە ستراتیژیەی نێوان دوو هێزی یەکسان هاتە ئاراوە، لە پێشکەشکردنی ئەنجامە مێژووییەکانی دوانەکەوت. ئەو رێکەوتنەی کە ئەنجامدرابوو، دانی بە ئۆتۆنۆمیەکی فراوان و دەسەڵاتی حوکمڕانی میرنشینە کوردەکان دانابوو. لەڕێکەوتنێك زیاتر، رێگای لەبەردەم ئیمپراتۆریەتی تورك ـ کوردی هاوشێوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا ـ هەنگاریا دەکردەوە. هەر چاودێرێك بە وردی تەماشای مێژوو بکات، ئەوا لە یەکەمین ئەزموونی شارستانیەتی سەرەتای هیتیتی ـ هوری ـ میتانی ساڵانی"2000"پ.ز تایبەتمەندی هاوبەشێتی ستراتیژی ئەنادۆڵا و میزۆبۆتامیا دەبینێت. یەکێکیان بەبێ ئەوەی تر ناتوانێت. پەیوەندی ئابووری ـ سیاسی بەخێرایی دەبن بە یەك. لە سەدە سەرنجڕاکێشەکەی عوسمانیەکاندا ئەو دیاردە مێژووییە سەرلەنوێ خۆی دەسلمێنێتەوە.
لەکاتێکدا قەوارەی نوێ قورسایی میرنشینە کوردە سوننیەکان لەناو ئیمپراتۆریەتدا زیاتردەکات، رەوشی کوردە عەلەوی و ئێزیدیەکان و چینی کرمانج کێشەکانیان سەختتردەبێت، ناکۆکی چینایەتی و مەزهەبی زیاتردەبن. ئەو قەوارە هاوبەشەی کە نزیکەی "300"ساڵا بەردەوام بوو، لە سەرەتای سەدەی"19" بەهاتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ رۆژهەڵاتی ناوین، بەرەو خراپبوون چوو. ئیمپراتۆریەتی بەریتانی کە لەرێگای ئێراق و میسرەوە کاریگەری خۆی لەسەر ناوچەکە زیاد دەکرد، هەوڵیدا کە میللیگەرایەك لە تەوەرەی سلێمانی پێشبخات. یەکەمین یاخیبوون لە ناوچەی سلێمانی لەلایەن سەرکردەکانی خێڵی بابانەوە ئەنجامدرا. ئەو پرۆسەی نزیکەی"200" ساڵ دەبێت بەشێوەی جیاوازەوە بەردەوامە، لەمیانەی نیمچە دەوڵەت ـ نەتەوەکەی ئەمڕۆ لە باشوری کوردستان بەڕێوەدەچێت. راپەڕینی کوردان لە سەدەی"19"دا بەهۆی تایبەتمەندێتییە چینایەتیەکان، میللیگەراییەکی سەرمایەداری بەراییە. سەرەڕای ئەوەی تەواوی میللەتەکانی ژێر بونیادی ئیمپراتۆریەت لەسەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە جیابوونەوە، هەروەکو ئاماژەمان پێکرد جیانەبوونەوەی کوردان لە تورکەکان هۆکاری مێژوویی خۆی هەیە. زهنیەتێکی دەوڵەت جێگای باسە کە سەرچاوەی خۆی لە شەریکایەتی چینی سەرەوەی هەردوو نەتەوە وەردەگرێت کە ناوکی دەوڵەتی ئیمپراتۆریەتن. هۆکارە ستراتیژیەکان، هەر شارستانیەکی هەڵکشاوی ئەو دوو گۆڕەپانە ناچار دەکات بە یەکەوە بجوولێنەوە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا هەبوون و بەرژەوەندی کۆمەڵگاکانی هەردوو گۆڕەپانەکە دەکەوێتە ژێر هەڕەشەوە. هەر قەوارەیەکی سیاسی و ئابووری کە دێتە ئاراوە، گوزارە لە بەهای بێ رادەی دۆخی هاوبەشبوون دەکات.
ئەزموونی سەڵتەنەتی سەلجوقی و عوسمانی تورك، جارێکی تر ئەو دیالیکتیکە مێژووییە پشتڕاست دەکاتەوە. ئەو هاوبەشیەتیەی لە سەرەوە لەنێوان بەگ و سوڵتانەکاندا هەیە، لەگەڵ بەسەرچوونی کات بۆ پەیوەندی نێوان شێخ و ئاغا و بازرگانەکان دەگۆڕێت. لەگەڵا هاتنی سوڵتان مەحمود لە"1808 ـ 1839" ئەو پەیوەندیانە خراپتربوون. کاریگەرییە خراپەکانی مۆدێرنیتە، ناکۆکی نێوان هەردوو لایەنی زیادکرد، سەرتاسەری ئەو سەدەیەی کرد بە سەدەی سەرهەڵدانەکان. مایەچووچبوونی سەرهەڵدانەکان و هەوڵەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ سەرلەنوێ خۆ بونیادنانەوە بە ئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوەوە، تایبەتمەندی نەریتی پەیوەندیەکانی نێوان هەردوو میللەتی تێکدا. کاتێك عوسمانییە گەنجەکان، جۆنتورك و توێژە هەرە میللیگەراکەیان جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی"1889" سەرەتا بەشێوەیەکی شاراوە دواتریش بە ئاشکرا بەرگرییان لە دەوڵەت ـ نەتەوەی تورك کرد، ئەو داپڕانە زیاتربوو. لەبەرامبەر ئەمەشدا میللیگەرایی کوردیش خۆی نیشاندا. بەمانا مۆدێرنەکەی کێشەی کورد لەو سەردەمەدا دەستپێدەکات. دەستپێکردنی کۆمیتەگەرایی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی و لەجیاتی میللیگەرایی ئیسلامی، بە شێوەیەکی ئاشکرا پەنابردنی بۆ تورکپەرستیەت کێشەکەی سەختترکرد. دوو چین دروستبوون: میللیگەرایی نەژادی تورك و میللیگەرایی ئیسلامی. کورد هەوڵیدا درێژە بە یەکێتیەکەی خۆی و نەریتی میللیگەرا ئیسلامیەکان بدات. شێخەکانی نەقشبەندی، مەولانا خالید و سەعید نورسی نوێنەرایەتی رەوتە بنەڕەتیەکەی ئەو مەیلەیان دەکرد. جەختیان لەسەر تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی ئیمپراتۆریەت و قەوارەی دەوڵەتی دواتر دەکردەوە. ئیسلام و ئایدیۆلۆژیای ئوممەت مۆدێرنیزە دەکران و بۆ ئەو مەبەستە بەکار

دەهێنران. شێخ و مەیلەکانی تەریقەت کە دوای بەگەکان (1878) نفوزو رۆڵی رێبەرایەتیکردنی کۆمەڵگایان زیادی کرد تا رۆژی ئەمڕۆمان درێژەیان بەو رێبازە داوە.
هەرچی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقییە، بەتایبەتیش دوای تێکشکانی لەشەڕی بەلقان لە"1912 ـ 1913" بیّ ئەوەی گوێ بەهاوبەشێتی مێژوویی نێوان ئەنادۆڵا و میزۆپۆتامیا بدات، لەناو دەوڵەتدا رووی لە میللیگەراییەکی رەگەزپەرست کرد. لەو میللیگەرایەتیەدا شوێن بۆ کوردان نەبوو. ئەوانیش وەك ئەرمەنیەکان یان زێدی خۆیان بەجێدەهێشت، یان ئەوەتا بەشێوەیەك لەشێوەکان لەناو دەبران. ئەوەی ئەو سیاسەتەی تێرخۆراك دەکرد پۆزیتیڤیزمی فەرەنسا بوو. چونکە تەنیا خاوەن هێز مافی ژیانی هەبوو. وەك بڵێی دەتەرمینیزمی داروین"ئەوەی بەهێزە دەتوانێت بژی"وەك خۆی، وەك راستیەکی زانستی، لەسەر کۆمەڵگاش پەیرەو بکرێت. لێرەدا درندایەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بەهەمموو درندایەتیەکەوە خۆی پیشاندەدات. ئەو ئایدیۆلۆژیا پۆزیتیڤیستە وشکەی نەك تەنیا ئەرمەنی، رۆم، سوریانی و کوردان، بەڵکو تورك و عەرەبەکانیشی بە دۆخێك گەیاندووە کەناتوانن تێیدا بژین، هەروەها بەدەستی جەمعیەتی ئیتیحادو تەرەقی بە کۆتاییهاتنی ئیمپراتۆریەت ئەنجامگیربوو. بەڵام کاریگەریەکانی لە تورکیای کۆماریشدا، هەژموونگەراییەکەی بەردەوام بوو. لەبەرئەوەی تایبەتمەندی جاکۆبینیزمی شۆرشی کۆمار، ئەو هاوپەیمانیەتیەی پشتی پێدەبەست و رێبەرایەتی مستەفا کەمال لە بەشی پێشوو هەڵسەنگێنران پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات. وەك هاوپەیمانەکانی تر کوردیش ئەندامی دامەزرێنەری کۆماربوون. وەك ئەوەی بە درێژایی مێژوو روویداوە دیسان وەك هاوپەیمانێکی ستراتیژی، هەم لە رزگاری ئومەت و هەم لە ئاواکردنی کۆماریشدا شوێنی خۆیان گرتووە.
کاتێك لە بەرامبەر بەخشینی موسڵ ـ کەرکوك جیاکاری دەوڵەت ـ نەتەوەی لەسنوورەکانی میساقی میللی لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا وەرگرت، هەم کوردان کران بە چوار پارچە، هەمان سیاسەتی کۆتاییهێنان بە کوردەکانی ئەو پارچەیەی لە دەستیدا مابوویەوە، بەخێراییەکی بیّ ئامان دەستی پێکردو بەهەمان خێراییش بەردەوامبوو. لەم نێوەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە پەیماننامەی قەسری شیرینی ساڵی"1639" کەلەگەڵا خانەدانی سەفەویدا ئەنجامدرا، لە دژی هاوپەیمانێتی ستراتیژی نێوان هەردوو میللەتەکە بوو. بەگشتی زۆربەی زۆری کورد لەناو سنووری ئیمپراتۆربەتی عوسمانی دابوون. بەدڵنیایەوە سنووری میساقی میللی لەسەر بنەمای یەکێتی کورد و تورکان ئاواکرابوو. ئەو رێکەوتنانەی لەگەڵا ئینگلیز و فەرەنسیەکاندا ئەنجامدران بەدڵنیایەوە لەدژی میساقی میللی بوو. بەڵام ئەو پرسیارە نەکراوە؛ کیّ لەو رێککەوتنە ناکۆکانە بەرپرسیارە؟ هەم بەرامبەر بەو قەرەبوو پەیوەندیانەی لەگەڵ هەندێك هێزی هەژموونگەرا ئەنجامیدەدەیت بوونی کوردان بۆ چوار پارچە دابەش دەکەیت، هەم دەڵێیت "هەندێك لە کوردان برایەتی هەزار ساڵی تێکدەدەن"! ئەو هەڵوێستە ئەوەندەی گاڵتە جاڕیەو نایەوێت راستیەکان ببینێت، بە درێژایی مێژووی کۆمار کێشەی کوردی رووبەرووی جینۆسایدی کلتووری کردەوە.
بەهۆی ئەو چەمك و رەفتارانەی رۆحی دۆستایەتی ستراتیژی هەزاران ساڵەی بەلاوە ناو نکوڵی لێکرد، کێشەی کورد تەنیا لە چوارچێوەی کێشەی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و سەربازی نەمایەوە، بەڵکو بوو بە مەسەلەی مان و نەمانی کلتووری میللەتێك. هەروەکو چۆن راپەڕینەکانی"1925 ـ 1940" سەرچاوەی خۆیان لە کێشەی مان و نەمان وەرگرت، هەربەو مەبەستەش بەکار هاتن. ئاشکرایە کە زهنیەتی ئیتیحادگەرا دەیویست کوردان لە دەوڵەت و کۆمەڵگا پەراوێز بکات، تەنانەت بیّ کۆمەڵگایی بەسەردا بسەپێنێت. لەبەر ئەوەش ئەو سیاسەتە بۆ پرسیاری "کورد هەیە یان نییە؟" گۆڕا کە بە ساڵان بەردەوامبوو. لەمیانەی هاوسۆزیکردنەوە پێویستە تێبگەن دەرخستنیان لە دۆخی ئەندامی دامەزرێنەری کۆمارو پەلکێشکردنیان بۆ ناو پرۆسەی لەناوبردن چەندە پەلامارێکی درندانەیە. کێشەی کورد کێشەی جیابوونەوە نییە، بەڵکو کێشەی رزگاربوونە لەژێر شاڵاوی لەناوبردن و دووبارە گەیشتنەوەیە بە پێگەی دۆستایەتی، هاوبەشایەتی و برایەتی ستراتیژی کە شایستەی مێژووە. تێگەیشتن لەم راستییە تەنیا لەمیانەی چەمکێکی هاوسۆزی بەویژدانەوە بەدیدێت.

ب ـ بنبەستبوونی پرۆژەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کۆمارو دەرکەوتنیPKK

ئەو هێزانەی لە ئاواکردنی کۆماردا رۆڵێکی سەرەکییان بینی، نوێنەرایەتی رێکەوتنێکی دیموکراتییان دەکرد. رێبەرایەتی مستەفا کەمالیش، هەم هۆکارو هەمیش ئەنجامی ئەو رێکەوتنەبوو. دەستوری"1921" و یەکەمین پێکهاتەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی تورکیا زۆربەباشی ئەو رێکەوتنەیان رووندەکردەوە. بەردەوام جەخت لەسەر هەبوون و پاراستنی ئوممەتی ئیسلام دەکرێتەوە، ئاماژە بە ئەندامێتی بنەڕەتی کوردو تورك دەکرێت لەهەمان ئومەت "ئوممەت بە عەرەبی بەواتای میللەت دێت" و میللەتدا، هەروەها باس لە دژەـ ئیمپریالیزم و دۆستایەتی سۆڤیەت دەکرێت. لە بەڵگەکانی ئەنجوومەنی نوێنەراندا راستی زۆرێك لە شوێنپەنجەی ئەو دیاردانە دێین. سۆسیالیستبوون و کوردو کوردستانیبوون بە ئاسایی پێشوازی لێدەکرێت. ئاشکرایە کە سەردەمی شۆرشی جاکۆبەنیکی کۆمار، گوزارشت لە رێکەوتنی گشتی کۆمەڵگا دەکات. لەو قۆناخەدا ئیمپراتۆریەتی بەریتانی ئامانجی سەرەکی بوو. بەڵام کاتێك لەرێگای شۆرشەوە رێگا لە داگیرکەری گیراو هەنگاو بۆ دەستنیشانکردنی سیستەمێکی نویّ هاوێژرا، کاتێك گروپێك لە لایەنگرانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لەناو کادیرە ئیتیحادگەراکان،

چ لەمیانەی ئالۆزیەکەی شێخ سەعید بێت، یان لەرێگای زۆرێك لە گەلەکۆمەو ئالۆزی و هەوڵەکانیان بۆ بێکاریگەرکردنی مستەفا کەمال ــ هەتا هەوڵی کوشتنیشی لەناودا ــ لە ساڵی"1925" بەدواوە قۆناخێکی گرنگی بڕیوە. لەسەردەمی سەرۆك وەزیرایەتی عیسمەت ئینینۆ ئەو گروپە بەهێزتر بووە. هەرچەندە ماوەیەکی کەم بەر لەمردنی مستەفا کەمال عیسمەت ئینینۆی بێکاریگەر کرد، بەڵام ئەنجامەکانی نەگۆڕی.
کاتێك دوای دووەمین شەڕی جیهانی، هەژموونگەرایی جیهان کەوتە دەست ئەمریکا، کاری ئەو گروپە ئاسانتر بوو. سەرەڕای خۆپیشاندانی بێلایەنی عیسمەت ئینینۆش، بەڵام نزیکی ئەو گروپەیە. چونکە لە راستیدا رێبەرایەتی پارتی دیموکرات پەیوەندی ستراتیژی لەگەڵا ئەمریکا نەبەست، بەڵکو رێبەرایەتی عیسمەت ئینینۆ ئەوەی جێبەجێکردووە. هێشتا بەر لە ئەندامێتی ناتۆ ، هەر لە ساڵی 1944 گروپێك ئەفسەری تورکیا رەوانەی ئەمریکا کران و پەروەردەیان بینی. لە سەردەمی پارتی دیموکراتدا پەیوەندییەکان خێراتربووە. لەساڵی"1952"دا، لەناو بونیادی سوپادا بەپێشەنگایەتی راستەوخۆی ئەمریکا رێکخراوی گلادیۆ گرێدراو بە ناتۆ، ئاواکراوە. لەتورکیا گلادیۆ سەرەتا خۆی وەك دەستەی تەدقیقی سەفەربەری رێکخستووە. دارایی و بەڕێوەبەرایەتیەکەی لەلایەن ئەمریکاوە دابینکراوە. لەو ساڵانە بەدواوە رێکخستن لقەکانی خۆی بڵاوکردۆتە، بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازی و کلتووریشی لەناودا، لەهەموو گۆڕەپانەکاندا خۆی ڕێکخستەکردووە. وەك چۆن تەواوی پارتە سیاسیەکانی کۆنترۆڵا کردووە، چینی کرێکاریشی لەمیانەی سەندیکای تورك ـ ئیشەوە کۆنترۆڵکرد کە لەساڵی"1952" لەگەڵ گلادیۆ دایمەزراند. سەرکوتکردن و فشارێکی لە رادەبەدەر لەسەر پارتی کۆمۆنیست و سەندیکاکانی درێژکراوەی سۆڤیت پەیڕەوکراوە. خۆی لە خۆیدا مەبەستی سەرەکییان، هەر دزەکردنێکی بچووکی جولانەوەی کۆمۆنیست و سۆسیالیستی ببینن، یەکسەر لەناویان بەرن. کوردایەتیش بە کۆمۆنیستی گرێدراوەو رووبەڕووی هەمان چارەنووس کراوەتەوە. لەم نێوەدا پەیوەندی ستراتیژی و شاراوە لەگەڵا ئیسرائیلی تازە دامەزراودا جێگای باسە. هەروەها بە شێوازی گلادیۆ پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵە، کەسایەتییە ئایینی و میللیگەرایی سەرەتاییە نەریتیەکانی ناو کوردانیش پێشخراوە. پەیوەندی هاوشێوە لەگەڵ رژێمی پاشایەتی ئێراق و ئێرانیش دەبەسترێت. "سەنتۆ"ش وەك رێکخستنی چەتری ئەو جۆرە پەیوەندیانەیە. خوازیارن لەمیانەی مۆدێلێکی بەمجۆرەوە کۆمۆنیزم لە خۆرهەڵاتی ناویندا بەربەست بکەن.
ئاشکرایە کە ئەو مۆدێلەی بە رێبەرایەتی ئەمریکا پێشدەخرێت، شێوەی نوێی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە کەدوای ساڵانی"1950" لەمیانەی شەڕی ساردەوە وەریگرتووە. لە ئاواکردنی ئەو مۆدێرنیزمەی کە لە رێگای ئەمریکاوە نوێ بۆتەوە، کۆماری تورکیا سەرەتا لە وڵاتی خۆی و پاشانیش لە رۆژهەڵاتی ناوین خاوەن رۆڵێکی سەرەکییە. ئەو مۆدێرنیتەیەی کە مستەفا کەمال دەیویست بەڕێوەی ببات جیاوازبوو. نزیکی شێوازی سۆڤیەت بوو و پشتی بە دۆستایەتی ستراتیژی یەکێتی سۆڤیەت دەبەست. ئەگەر جیاوازی نێوانیان نەبینین، ئەوا ناتوانین ساڵانی"1950"و بگرە ئەو فاکتەرانەی لە مۆدێرنیتە شیکاربکەین کە دوای ساڵی"1925" لە دەرەوەی ئیرادەی مستەفا کەمال پێشخراون. پراکتیزەکردنی فاکتەرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی، لەنێوان هەردوو مۆدێرنیتەکاندا، جیاوازیەکی جدی بژاری چینایەتی، سیاسی، دیبلۆماسی و ئابووری لە ئارادایە. لە ئەنجامدا ئەو هێزەی لە تێکۆشانی هەژموونگەراییدا سەرکەوتووە، سەرەتا ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا، پاشانیش ئەمریکا بووە. وەك دەزانرێت کە بەردەوام پەیوەندی ستراتیژی لەنێوان هەردووکیاندا لەئارادایە. ئەو مۆدێرنیتە پەیڕەوکراوە تەنیا بە مایەپووچکردنی رێکەوتنی دیموکراتییانەی کۆمار نەوەستاوە، لەرێگای ئەو شەڕەی لەبەرامبەر هەموویاندا دەستی پێکردووە، هێزە هاوپەیمانە سەرەکیەکانی کردۆتە دوژمنی یەکتر. ئەمە ئەو خاڵەیە کە لەتێگەیشتنیدا مستەفا کەمال زەحمەتی بینیوە. لێرەدا رۆڵی کاریگەری قووڵی ئایدیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست لەسەر مستەفا کەمال جێی باسە. هەرچەندە ئەشقی بۆ ئازادی و سەربەخۆیی، رێزی زۆری لە بەرامبەر کلتووری هەرێمی و کلتووری ئەنادۆڵا، رۆڵی خراپەکارانەتری پۆزیتیڤیزمی بەربەست کردبێت، بەڵام نەیتوانیوە رێگری لەکاریگەریەکانی بکات.
دۆگماتیزمی پۆزیتیڤیست کە لە شوێنی دۆگماتیزمی ئایینی جێگیرکراوە، تا ئێستاش کاریگەریەکی قووڵی لەسەر بەشی میللیگەرایی عەلمانیدا هەیە. بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە ئەو عەلمانیەتە کۆماریگەراییەکی دیموکراتی، تەنانەت کۆمارگەراش نییە، بەڵکو دەسپۆتیك و دیکتاتۆرییە. کرداره نموونەییەکەشی ئیتیحادگەرایی و ئەوەندەی کاریگەریشیان لێکردووە"CHP" گەریەتییە. ئەو تێزانەی کە فەیلەسوفی مافناسی و سیاسی کارل سمیت لە ئەڵمانیای ساڵەکانی "1920 ـ 1930"کان سەبارەت بە تیۆلۆژیای ئایینی و سیاسەت پێشیخستووە، دەرهەق بە تورکیا گونجاوترە. سەرجەم دەستەواژە سیاسیەکانی مۆدێرنیزم، بەرامبەرەکەی لە تیۆلۆژیای چاخی ناوەڕاست، هەتا بەڕوای من لە چاخی یەکەمدا هەیە. ئۆرژیناڵەکەی هی سۆمەرە. ئەوەی پۆزیتیڤیزم کردوویەتی، ئەو دەستەواژانەی بە جیلوەی مۆدێرنیتە بۆیاخکردووەو بەناوی "زانستیبوون"ەوە خستوویەتیە بازاڕەوە و بەناوی سەرمایەداری پێشکەشی دەکات. ئەگەر لە ناکۆکی و لێکچوونەکانی بابەتی دۆگماتیزمی ئایینی و پۆزیتیڤیست لە دۆخی دوودڵی و گومانەکانی مستەفا کەمال، رەوشە رۆحییە نائارامەکەی و شەو تا بەیان خوێندنەوەی پەرتووکەکانی دەرهەق بە شارستانیەت بگەڕێین ئەوا واقیعی و رۆشنکەرەوە دەبێت.
بینین و تێگەیشتنی ئەو خاڵە زۆر گرنگە کە تەواوی کادیرە بژاردەکانی کۆماری تورکیا لە بابەتی مۆدێرنیتەدا شانبەشانی نەزانی و بێ باوەڕیەکی قووڵ لەناو دۆگماتیزمدا دەژین. ئەو خاڵە سەبارەت بە سەرجەم دوالیزمێکی وەك راستڕەو ـ چەپڕەو، عەلمانی ـ ئایینی، عەلەوی ـ سوننی، تورك ـ کورد ...هتد لەجێگای

خۆیدایە. تا ئێستاش ئەو خاڵە شیکار نەکراوە کە لەسەردەمی کۆماردا شەڕی لەنێوان ئومەتگەرا ئیسلامیەکان، سۆسیالیست، میللیگەرا کوردەکان تەنانەت بەشێکیش لە میللیگەرا تورکەکان لەگەڵ فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری چۆن پێشخراون و ئاراستەکراون. بەتایبەتیش لە رێگای ئاراستەکردنەکانی گلادیۆ لەلایەن ئەمریکاوە، ئەنجامی زۆر جەرگبڕو خراپی لەگەڵا خۆیدا هێناوە. تا پەیوەندی چەمك و رێکخستنبوون و کۆمیتەگەرایی کودەتاچیەکانی سەدان ساڵەی ناو دەوڵەت لەگەڵ فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆشن نەکرێتەوە، قەیران، ئالۆزی و شەڕەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەرکیان پێناکرێت. روونکردنەوەی رۆڵی پەیوەندیەکانی لەگەڵا هێزە هەژموونگەراکانی سیستەم، بەتایبەتیش پەیوەندیەکانی لەگەڵا بەریتانیا و ئەمریکا و ئالۆزی و شەڕدا، رۆڵێکی ژیانی لەدیموکراتیزەبوون و چارەسەرکردنی کێشەی کورددا دەبینێت. تەنیا لەمیانەی دەرککردن بەو راستییەی کامە هێزی ناوخۆیی و دەرەکی لە پڕۆژەی مۆدێرنیتەی کۆماردا کاریگەربوون و هەروەها تێگەیشتنی هەژموونگەرا ئایدیۆلۆژیەکەی پێیەوە گرێدراون و کردەوە ئابووری، سیاسی و سەربازیەکانیانەوە دەتوانین تێبگەین بۆچی هەوڵە سەربەخۆخوازو ئازادیخوازیەکانی مستەفا کەمال و شوێنکەوتووەکانی کە بانگەشەی دڵسۆزبوونیان بۆ دەکرد بێ ئاکام بوون و ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە.
هەروەها کودەتا سەربازی و پاشکۆ سڤیلەکانی سیاسیەکانی، جگە لە گرێدان بە بازنەی هۆکار ـ ئەنجام بەولاتر هیچ رۆڵێکیتریان نەبوو. ئەوەش دەستنیشانکردنێکی هاوبەشی کۆمەڵناسەکانە کە تەواوی هەوڵەکانی ئەوان بۆ رزگارکردن رەوشەکەی سەختترکردوەو قوفڵی کردووە. چونکە پڕۆژەی مۆدێرنیتەی کۆمار، هەر لە سەرەتاوە بە سەقەتی لەدایك ببوو. ئەو سەقەتییەی پێویستە بەپێداگریەوە دەستنیشانبکرێت؛ کۆمار لەگەڵ هێزە بنەڕەتیەکانی رزگاری و دامەزرێنەری کۆمار خرایە ناکۆکی و شەڕەوە. ئەگەر بەریزە دیاری بکەین، ریزکردنی ساڵەکانی"1925 ـ 26، 1930، 1937 ـ 38، 1945 ـ 50، 1960، 1970، 1980، 1997، 2001 ـ 2002 بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا سەقەتی بونیادەکەی پیشاندەدات.
لە ماوەی نێوان"1965 ـ 1980" ئەندامە بنەڕەتیەکانی دامەزرێنەری کۆمار ویستیان سەرلەنوێ دەنگی خۆیان بەرزکەنەوە. بەبێ ئەوەی بەرەی هێزی هەژموونگەرای نەریتی بەرامبەریان و ئۆلیگارشی لە ئاستی پێویستدا بناسن و شیکاری بکەن، بەهەڵوێستێکی پەرچە کرداریەوە بەدوای دۆزینەوەی خۆیانەوە بوون. وەك زۆر بانگەشەی بۆ کراوە، لە رەوشێکی وەهادا نەبوون کە بتوانن شۆڕش یان دژە شۆڕش پێکبێنن، بەڵام بەم شێوەیە پێناسەکران. کاتێك سەریانهەلدا، بەشێکیان لەناوبران و دزەیان کردە ناو ئەوانەی مابوونەوەوماڵییان کردن. چەندە جێگای داخە ئەو هێزانەی لەبەرامبەر یەکتری بەکارهێنران، لەتێگەیشتنی رۆڵی گلادیۆ دووربوون. هەڵبەتە لێرەدا جیاوازی لە نێوان ئەوانەی بەباوەڕیەکی بەهێزو دڵسۆزانە بۆ ئازادی و سەربەخۆیی و یەکسانی خەباتیان دەکرد و دژەکانیان حاشا هەڵنەگرە. بەڵام پەیوەست بوونیان بە کودەتاکانیشەوە راستیەکە. ئەو رێکخستنە میللیگەراو ئایینگەرایانەی لەو سەردەمەدا پێشخران پەیوەندیەکانیان لەگەڵا تاکتیکەکانی گلادیۆی دژە کۆمۆنیست، بەرچاوترە. هەروەها کاریگەری ئەو هێزانە لەسەر ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتیش گرنگە. ئەوەی لەسەر هەموو بوارەکانی ژیاندا خاوەن رۆڵی دیاریکەرە، بەڕێوەبەرایەتی سەرەوەی گلادیۆی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. لێرەدا کۆنترۆڵاکردنی سوپا و بونیادە سیاسیەکان لەسەرووی هەموویانەوە دێن. بەو شێوەیە بەکارهێنانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمار، ئاشکرایە وەك بەردەوامکردنی کارەکتەری کۆمیتەگەری ئیتیحاد و تەرەقییە. هەوڵەکانی مستەفا کەمال بۆ پووچەڵا کردنەوەیان بەشی نەکردووە. هەتا نەریتی کۆمیتەگەرایی کودەتاچی کۆنترۆڵی گلادیۆ دەربازنەکرێت، ئەوا سیستەمێکی کۆماری خاوەن کارەکتەری دیموکراتی و حقوقی بەدینایەت و جێگیر نابێت.
لەژێر رۆشنایی ئەو شیکارانەوە دەرکی پێدەکرێت کە بونیادی بنبەستبووی کۆمارو کێشە ئافرێنەرەکەی رۆڵێکی بەرچاوی لە دەرکەوتنیPKK دا بینیوە. ساڵانی"1970" بەڕاستی ئەو سەردەمە بوو کە جولانەوە دیموکراتیەکان هێزیان بەدەستخستبوو. کودەتای"12 ئادار"یش ئەو هێزەی نەبوو کە بتوانێت ئەو قۆناخە بوەستێنێت. ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی کە لە دامەزراندنی کۆماردا بەکاریگەربوون، سەرلەنوێ دەردەکەوتنەوە سەر سەکۆی مێژوو؛ سۆسیالیست، ئیسلامگەراو میللیگەراکانی کورد لەناو کۆمار بۆ خۆیان لە مەشروعیەت دەگەڕان. هەڵگری داواکارییە دیموکراتیەکان بوون. ئەگەر ئەو داواکاریانە لە رێگای کودەتاو رەفتاری فاشیستیانە سەرکوت نەکرابوانایە، لەمیانەی دیموکراتیزەبوونەوە بە رێگەچارە دەگەیشت. بەڵام درێژەدان بە شەڕی ساردو قەیرانی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتە لەرێگای پەیڕەوی سەرکوتکارو فاشیستانەترەوە وەك بژارێك پەیڕەوکرا. کۆماری تورکیا بووە ئەو وڵاتەی کە کۆنترۆڵی گلادیۆ بەشێوەیەکی زۆر بەهێز تێیدا بەڕێوە دەبرێت. رژێمی"12"ئەیلولیش وەك نموونەیەکی هەرە مەترسیداری ئەو کۆنترۆڵە پێشکەوت.
تەواو سەرکوت نەکردنی "PKK"پەیوەندی بە بونیادی ناوخۆی کوردان و ئالۆزیەکانی رۆژهەڵاتی ناوینەوە هەبوو. لە راستیدا کودەتای "12" ئەیلول لەماوەی"24"کاتژمێردا هەر شوێنێکی پاککردەوە. لە بەهەڵەداچوونی لە بابەتی کورداندا، هۆکاری کۆمەڵایەتی قووڵا جێگای باس بوو. لەو بڕوایەدابوو کە کورد وەك کۆمەڵگاو گەل لەناوچووە. دوای سەرکوتکردنی سەرهەڵدانەکان و قۆناخێکی دژواری ئاسیمیلاسیۆنەوە، لەو باوەڕەدابوون جارێکی تر کوردان ناتوانن بێنەوە هۆش خۆیان. زهنیەتی نوێی کۆمەڵایەتی بەتایبەتیش چینی ناوین و ئەو بیرۆکراسیەتەی کە لەسەر بنەمای فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەرەیانسەند لەو باوەڕەدابوون چیتر کوردان لە مێژوودا سڕاونەتەوە. رۆڵە مێژووییەکەیان لەبیرکرابوو. ئەو بوونە تاك و تەرایانەی کە ماشبوون هاوتای بوونەوەرە سەرەتاییەکان دەبینران. توێژی سەرووش لە مێژبوو بە هەڵوێستی خزمەتکار لە پاشا پاشاترە،

وەستایانە ڕۆڵی خوڵامێتی دەسەڵاتیان دەبینی. هەرچی ئەو میللیگەراو تەریقەتانەشن کە لەگەڵا ئەمریکا لەناو پەیوەندین، لەجیاتی پەیوەستبوون بە بەرخودان و ئازادی، زیاتر لە زەمینەیەکی دژایەتیدا دەهێڵرانەوە. هەرچەندە دووچاری خراپەکاریش هاتبێت لەو هەلومەرجەدا PKK توانی پەیوەندی لەگەڵ لادێیی و هەژارانی شاری بەشی کرمانجی دینامیزمی کۆمەڵگای کوردەواری ببەستێت. سوودی لە هەستی وڵاتپارێزی و کوردایەتی و بونیادە کلتووریەکان وەردەگرت، بگرە سەرلەنوێ دەیئافراندەوە. سەرەڕای ئەو هەموو سەرکوتکردن و پارچەبوونەشی، دیسان سروشتی کۆمەڵگای کوردی بونیادەکانی لەخۆوە دەگرت. ئەوەی پێویست بوو، کەمترین هەستی وڵاتپارێزی و تێگەیشتنی هەندێك چەمك و دەستەواژەبوو. لە"PKK"ی ئەو سەردەمەدا، ئەو سۆزو چەمکە بەکاریگەرانە، لە ئاستێکی پێویستدا هاتبوونە ئاراوە. ئەوەی بۆی پێویست بوو، کادیری باڵای دیبلۆماسی و سیاسی نەبوو، بەڵکو جولاندنی ئەو سۆزو چەمکە بوو بە خێراییەکی زۆرەوە. چەند چالاکیەکی سنووردار بە خێرایی ئەوئاستەی بە دەست هێنا.
لەدەرکەوتنی ساڵانی"1970" هەتا سەرەتای ساڵانی"1980" بەو شێوازە بەردەوامبوو. کاتێك بەکارهێنانی هێزی رادەبەدەر لەلایەن رژێمی"12"ئەیلول، داپلۆساندنی پێشوەختی هێزە چەپرەو و بەرهەڵستکارەکانی ترو راستینەی زیندانی دیاربەکرو جێگیربوونمان لە رۆژهەڵاتی ناوین گەیشتنە یەکتری، دەستپێکردنی ئەو قۆناخەی بەقەڵەمبازی "15ی ئابی 1984" ناو دەبرێت زەحمەت نەبوو. لە راستیدا دەتوانرا لە"1982"دا ئەو قەڵەمبازە دەستپێبکات. بەڵام کاتێك هەندێك لە کادیرانمان لە شاخ بەشێوەیەکی شایستە ئەرکەکانیان جێبەجێنەکرد، ئەو هەڵمەتە تا"ئابی 1984" دواکەوت. شەڕی ئێران و ئێراقیش کۆمەکی بەو چوارچێوەیە گونجاوە کرد. بەڵام هیچ کاتێك بزووتنەوەکە لە کوردستانی تورکیا کەم نەبوو، بەردەوام هەبوونی خۆی پاراست. ناتوانین باسی گەریلایەتیەکی زۆر شارەزایانە بکەین. بەڵام کاریکاتێری گەریلایەتیمان جێگای باس بوو. تەنانەت ئەوەنتاژەکانی هەڵمەتی 15ی ئابیش کە بۆ دەوڵەت قەڵەمبازێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، زۆر بەخراپی بەکارهێنرا. سەرەڕای هەموو بەرهەڵستکاری و دزەکردنی دەوڵەتان و هێزەکانی کوردستانی ئێراقیش، بەڵام جێگیربوون لەرۆژهەڵاتی ناوین، بۆ بەردەوامکردنی بزووتنەوەکە و بەدەستهێنانی پشتیوانی هەموو بەشەکانی کوردستان و کوردانی ئەوروپا بەس بوو.
کاتێك شێوازی دەستێوەردانی رژێمی"12"ئەیلول ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە، بەپشتیوانی ناتۆ دەربازی سەردەمی باری نائاسایی و ژیتەم بوون. گلادیۆی ناتۆی ژێر سەرکردایەتی ئەلمانیا، لەساڵی"1985" بەدواوە بەشێوەیەکی کاریگەر کەوتبوە جموجۆڵەوە. پیلانگێریەکانی تیرۆرکردنی پاپاو ئۆلف پاڵمە، بەو رادەیەی لە چوارچێوەی حیسابە گشتیەکاندایە، پەیوەندی راستەوخۆو ناراستەوخۆی بە قەلەمبازی گەریلایی کوردستانەوە هەیە. سەردەمی "1973 ـ 1983"ی دەرکەوتنی "PKK" قۆناخێك بوو کە کاریگەری لایەنی ئایدیۆلۆژی و سیاسی لە پێش بوو، لایەنی چەکداریش لاوەکی بوو. قەڵەمبازی"1984" لایەنی چەکداری لەپێش بوو، بەڵام پێشکەوتنە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکەشی بەردەوام بوو. راوەستەکردنێکی زۆر لەسەر ڕۆڵی باری نائاسایی و ژیتەم پێویستە. وەك دەزانرێت چەندین چالاکی خراپەکارانە لە ناوەوەو دەرەوەی بزووتنەوە ئەنجامدران. دەشێت ئەو چالاکیانەی کە ژن و منداڵی لەیەکتری جیا نەدەکردەوە، بە ئامانجگرتنی ئەوانەی پێویست بوو بە ئامانج نەگیردرێن، هەروەها مەیلە مەزاجیەکان و خاوەن دەرنەکەوتن لە بچووکترین ئەرکیش، لەم چوارچێوەیەدا بژمێرین.
بەڵام ئەوەی جێی سەرسورمانیشە ئەوەیە هەرچەندە "PKK"وەك شەیتانیش نیشانبدەن، ئەوەندەی تر دەبێتە خاوەن هێز. ئەوەش تینووبوونی قووڵی گەلی کورد نیشاندەدات. سەرەڕای ئەوەی بزاوتە گەورەکانی کۆچپێکردنی سەر کوردان چەندین قات لە کۆی بزاوتەکانی سەر ئەرمەنی، ڕۆم و سوریانییەکان زیاتریش بێت، بەڵام هەموو شتێك بە ئەرێنی لەخانەی"PKK" دا رەنگیدەدایەوە. هەڵبەتە لێرەدا هەلومەرجە مێژوویي و جوگرافیەکان بەکاریگەربوون. وەڵامدانەوەی داواکاریەکی مێژوویی، واتە پاراستنی هەبوونی کۆمەڵگاو خاوەنداریکردن لە کەرامەتی مرۆڤایەتی، فاکتەری سەرەکی و دیاریکەری ئەو پێشکەوتنە بوون. پێویستە کاروانی ئاسایی و داخوازییە مێژووییەکان بچووك نەبینرێن.
ئەو سیاسەتەی سەرۆك کۆمار بەڕێز تورگووت ئۆزال، لەساڵی"1992" بەدواوە سەبارەت بەکورد پەیرەوی کرد چاوەڕوان نەکراوبوو. درەنگ هەستمان بە گرنگیەکەی کرد. ئەو چانسە جدییەی چارەسەری کە بە مردنی ئەو پووچەڵکرایەوە، لەلای خۆمەوە بەردەوام وەك زیانێکی مێژوویی یادی دەکەمەوە. دەبوو ببێت بە چانسی چارەسەری دیموکراتی کۆمار، بەڵام بەبڕوای من هەندێك هێزی گلادیۆ بە ئەنقست ئەو چانسەیان نەدا. کاتێك سەرفەرماندای سوپای ئەو کات دۆغان گورێش لە ئینگلتەڕا دەگەڕایەوە لە لێدوانێکیدا وتی"لامپی سەوزم بۆ هەڵکراوە" بەشێك لەم راستییە دەخاتە ڕوو. دوای مردنی تورگووت ئۆزال، کودەتای تانسۆ چیللەرو ئەو پیلانگێرییە یەك لەدوای یەکانەی لەناوەوەو و دەرەوەی سوپا ئەنجامدران، یەکێك لەو گرێکوێرە سەرەکیانەیە کە پێویستە شیکاربکرێت. بەڵگاندنی سیخوڕایەتی تانسۆ چیللەر بۆ "CIA"تا رادەیەك ئەو گرێیە ڕوون دەکاتەوە. کوشتنی کۆمەڵێك رۆشنبیرو پێشەنگە ئەتاتورکچی و کوردەکان، بە هەزاران تاوانی کوشتنی بکەری نادیار، چۆڵکردنی گوندەکان و هارکردنی حیزبوڵا، بە بڕوای من یەکێکە لە پیلانگێرییە هەرە گەورەکانی سەر کۆمار. سەردەمی پیلانگێری و یاخیبوونەکانی ساڵانی"1924 ـ 1927" کۆماری قۆناخی مستەفا کەمال وەبیر مرۆڤ دێنێتەوە. لەو ساڵانەشدا فاکتەرە دیموکراتیەکانی بناخەی کۆمار لەناو دەبرێن. ئەو ڕەوشە هێشتا ڕوون نەکراوەتەوە. بەڵام ئاشکرایە ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست هێناوە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیاو مۆدێرنیتەی

سەرمایەدارییە. پێویستە رۆڵی هەژموونگەرایی دەرەوەو بەکرێگیراوەکانی لە مایەپووچکردنی چانسی چارەسەری دیموکراتییانەی سەرەتاکانی 1990 کان بچووك نەبینرێت کە لەرێگای پیلانگێری، یاخیبوون، تاوان و لەناوبردنی کوردان بەرێوەچوو. نموونەگەلێکی زۆر کەم هەیە بە ئەندازەی ئالۆزی، کۆمەڵکوژی، ئاژاوەگێری و بزووتنەوەی دیموکراتی لە ساڵانی"1993 ـ 1997" کۆنترۆڵی هەژموونگەرایی سەر کۆمار روون بکاتەوە.
باسی قۆناخێکی زۆر سەیرو بێهاوتا دەکەین کە خەسڵەتی یاسایی، عەلمانی، کۆمەڵایەتی و دیموکراتی دەوڵەت بەتەواوی لە بەینبراوە، کەوتۆتە ژێر کۆنترۆڵی ژیتەم و خزمەتی بونیادە پاوانخوازەکانی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە. لە کۆتایی ئەو قۆناخەدا وەڵامێکی ئەرێنیمان دایە ئەو لێگەڕینانەی پەیوەندی بەستن کە لەلایەن سەرۆك وەزیر بەڕێز نەجمەدین ئەربەکانەوە بەرێگای سەرۆك کۆماری سوریاو لەرێگای برۆکسلیشەوە بەشێك لە سوپا بەناوی بەشی پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەوڵیان بۆ دەدا. ئالوگۆڕکردنی نامەو زانیاری جێگای باس بوو. بەڵام لە ئەنجامی لەسەرکار لابردنی نەجمەدین ئەربەکان و دەرکەوتنی من لە رۆژهەڵاتی ناوین، ئەو هەنگاوەش مایەپووچ بوویەوە. لەو باوەڕەدام پێویستە رۆڵی ناوەندەکانی گلادیۆی ناوخۆو دەرەوە لەو مایەپووچکردنەوەیە بچووك نەبینرێت. دەرفەتی بەربەستکردنی ئەو قەیران، پێکهەڵپژان و شەڕە هەبوو کە تا ئێستاش کۆمار پێیدا تێپەڕدەبێت. رەوشی ئاگربەستی یەکلایەن و دۆخی پەیوەندییەکان ئەو دەرفەتەیان رەخساندبوو. ئەو هەوڵانە سەرکوتکران و بە ئەنقەست پرۆسەکە پووچەڵا کرایەوە. ئەو چانسە لەبەینبرا کە بۆ چارەسەری هاتبووە ئاراوە.
دەرکەوتنم بۆ ئەوروپا و لێگەڕینم بۆ چارەسەری سیاسی، بەشێوەیەکی زۆر ئاشکرا لە رێگای ئینگلتەراوە پووچەڵا کرایەوە. هاوکاری ئینگلتەرا لەگەڵا گلادیۆی بەڕێوەبەرایەتی ئەسیناو بەکارهێنانی فرۆکەیەکی تایبەت لەسوێسراوە و رفاندنی من بۆ کینیا، زۆر بە باشی ئەو راستییە روون دەکاتەوە. بێگومان سەرجەم دەوڵەتە ئەوروپییەکانی ئەندامانی ناتۆ لە ئۆپەراسیۆنەکەدا هەبوون، بەڵام ئینگلتەرا مێشکی بەڕێوەبەرایەتی بوو. ئەمریکاش جێبەجێکاری فەرمی بوو. ئیسرائیلیش رێنیشاندەر بوو، ئەو هێزە بوو کە مانەوەمی لەمۆسکۆ ئاستەنگ کرد. لەراستیدا هەم لە کینیاو هەم کاتێك لە رۆژهەڵاتی ناوین بووم، بەئاشکرا هەوڵیاندەدا پەنایان ببەمەبەر. بەڵام متمانەم پێنەکردن، هیچ کاتێکیش بیرم نەکردەوە باوەڕییان پێ بکەم. لە کەسایەتی مندا خوازیاری رادەستگرتنی چانسی ئازادی کوردان بوون. منیشی لەناودا زۆر دڵنیابووم کە نابێ هیچ کەس بوێری ئەوە پیشانبدات و بیر لەشتێکی بەمجۆرە بکاتەوە. زۆر سەیرو سەرنج راکێش بوو؛ ئەو گەمانەی کە لەسەر بەڕێوەبەرایەتی کۆمار دەکران، لە سەر من و بە رێگای"PKK"شەوە دەیانویست لە سەرکوردانی بەڕێوەببەن. دیسان ئەوەی دەستبەکاربوو فاکتەرەکانی مۆدێرنیتە سەرمایەداری بوو کە بەهەزار و یەك پەتەوە بەیەکەوە گرێدراون.
پەندو ئەزموونم لە بوویەرەکان وەرگرت و لە قۆناخی ئیمرالیدا ئارام و لەسەرخۆ بووم. لە قۆناخەکانی لێکۆڵینەوە، دادگایکردن و بەندکردنمدا ئەو هەڵوێستەم پاراست. لەو پڕوایەدام لێکۆڵەرەوەکان بەتاکتیکی رۆژانە نزیك بوونەوە. راوەستە ئارام و لە سەرخۆکەی منیان بە هەڵە شرۆڤەکرد. هەمان شرۆڤەی هەڵە لەناوخۆو دەرەوەی رێکخستنیش دەکران. بەڵام سەرەڕای هەموو شرۆڤە هەڵەکانیش هەڵوەستەی خۆم خراپ نەکرد. هێشتاش لە"11"مین ساڵوەگەڕی ئەو راوەستە تەنیاییەدام. بەدرێژایی ئەو قۆناخە بەرگرینامەیەکی چوار چینیم ئامادەکرد.

چینی یەکەم لە بەرگرینامەکانم: لەقۆناخی دادگایی کردندا هەوڵمدا لەشێوەی پەرتوکێکی بچووك بەناوی "مانیفێستۆی چارەسەری دیموکراتی" پێشکەشی بکەم. هەرچەندە زۆر بەهێزیش گوزارشت نەکرابێت، بەڵام بەردەکانی بناخەی هەڵسەنگاندنێکی رێگەچارەی دیموکراتییانە پێشکەش دەکات. نەقۆستنەوەی لەلایەن حکومەت و ناوەندە سیاسیەکانەوە، زیانێك بوو. قۆناخەکە بەتەواوی بۆ ئاراستەی هەرەمەکی خۆی جێهێشترا، لەو پڕوایەدابوون کە بەو شێوەیە چارەسەر ببێت. هەندێك هەنگاوی چارەسەرئامێزی سەرۆك وەزیری ئەو کات بەڕێز بولند ئەجەوید، لەلایەن پارتی بزووتنەوەی نەتەوەپەرستی"MHP"ی هاوبەشی حکومەتەوە پووچەڵا کرایەوە. تەنانەت پارتی دادو گەشەپێدان "AKP"نەیویست لەکێشەکەش تێبگات. لەوانەیە "نەخشە رێگایەك" بەس دەبینێت کە پێشتر نەخشەی بۆ دانراوەو لە تەوەرەی پەیوەست لەگەڵا بەڕێوەبەرایەتی باکوری ئێراق"باشووری کوردستان" دایە. ئەو نامانەی بۆ بەڕێوەبەرایەتی سەروو، سەرۆك وەزیران عەبدوڵڵا گوڵا و رەجەب تەیب ئەردۆغان نووسیم و هەروەها ئەو بەرگریانەی لەبەرامبەر ئەو "11" جار سزای گۆشەگیری ناو ژووری ئینفیرادی نووسیومن هیچ وەڵامێکیان نەدرایەوە. تا ساڵی"2005" کاتەکە بەفیرۆ چوو. بۆیە قۆناخێکی دەستپێکردنەوەی چالاکیەکان دەستلێبەرنەدراو بوو.
چینی دووەم لە بەرگرینامەکانم: ئەو بەرگرینامەیەم بەشێوەی دوو پەرتووك بەناوی" لەدەوڵەتی راهیبی سۆمەرەوە بەرەو شارستانیەتی دیموکراتی(بەرەو کۆمار)" بۆ یەکەم دانیشتنی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پێشکەش کرابوو. ئەزموونێکی قووڵتری رێگەچارەی دیموکراتی بوو.

چینی سێیەم لە بەرگرینامەکانم: ئەو پەرتووکەی بەناوی "بەرگریکردن لە گەلێك" بڵاوکراوەتەوە، پێشکەش بە دانیشتنی دائیرەی گەورەی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا کراوەو چینی سێیەم پێکدێنێت. سەرهەڵدانی

کێشەی کورد و ئەگەرەکانی چارەسەری بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوەتر گەیشتبوو.

چینی چوارەم لە بەرگرینامەکانم: ئەو قۆناخەی هێشتا بەناویدا تێپەڕدەبم، وەك چوارەمین و دوایین چینی بەرگرینامەکانم هەڵدەسەنگێنم. ئەو بەرگرینامەیەی لەژێر ناوی "مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی" دایە لەپێنج بەرگ پێکدێت " 1ـ شارستانیەت، 2ـ شارستانیەتی سەرمایەداری، 3ـ سۆسیۆلۆژیای ئازادی، 4ـ لە رۆژهەڵاتی ناوین شارستانێتی دیموکراتی، 5ـ چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی لە تورکیا و کوردستان "، تا ئێستا چوار بەرگی تەواو بووە. لە ماوەی داهاتوودا هەوڵی تەواوکردنی بەرگی دوایی"بەرگی پێنجەم" دەدەین. ئەو هەڵسەنگاندنەی ئێستا بەناوی"نەخشەی رێگا" پێشیدەخەم، وەك شێوەی سەرەتایی بەرگی کۆتاییە.
قۆناخی ئەو 25 ساڵەی "1984 ـ 2009" دوایی کە خەباتی چەکداری رۆڵێکی سەرەکی تێدا بینیوە، دەشێت وەك شەڕی حەقیقەتەکان هەڵسەنگێنرێت. لە رزگاربوونی کۆمەڵگایەك زیاتر، گوزارشت لە خستنەڕووی راستیەکان دەکات. رووبەڕووبوونەوەی حەقیقەت لە ئاستی جیهاندا بووە. چونکە کێشە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکان بەو رادەیەی حەقیقەتی خۆیان دەرخستۆتە روو دەتوانن بکەونە سەر رێی چارەسەری. لە راستیدا سەرکەوتنی چەکداری شەڕی پاراستنی رەوا نەبێت، بەتەواوی سەرچاوەی کێشەکان پێکدێنن. لەشەڕی"25" ساڵەدا لە سەرکەوتن و بنکەوتن زیاتر، ئەوە گرنگە کە چەندە رۆڵی چارەسەری بینیوە. پێویستە بپرسین شەڕی"100"ساڵەی نێوان ئینگلتەراو فەرەنسا، لە سەلماندنی ئەو راستیەی کە "دەریای مانش" دەتوانێت ببێتە سنوور بەولاوە بەکەڵك چیتر هاتووە؟ لە سەلماندنی هەبوونی کورداندا ئەو چارەکە سەدەی رابردوو دیاریکەربووە. تاجدارکردنی بوونی کوردان بە دەوڵەت ـ نەتەوەیەك یەکێك لە ئامانجەکانی"PKK" ی قۆناخی سەرەتا بوو. بەڵام لەکۆتاییەکانی قۆناخدا لەرێگای سەدان ئەزموونەوە فێربووین کە ئەو تاجە پێویست نییە، بەپێچەوانەوە لەوانەیە ببێتە سەرچاوەی کێشەی نوێ، بەڵکو پێکهاتەی سیاسی دیموکراتییانەی کۆمەڵگا مانادارترەو چارەسەری دەئافرێنێت.
دەرککردن بە پرۆسەکانی پەرەسەندن و وەرچەرخانی "PKK"رێگایەکی هەرە راستی تێگەیشتنی خودی خۆشیەتی. لە هەلومەرجەکانی شەڕی ساردی دونیای حەفتاکانPKK ش سەر بە بلۆکی سۆسیالیزمی بونیادنراو دادەنرا. بەلانی کەم نیاز وابوو. ئەو سەنگەرانەی تێیدا جێگیریش ببوو گوزارشتی لەو دۆخە دەکرد. بەڵام ئاستە رۆشنبیریەکەی، ئاستی سۆزو دەستەواژە شۆرشگێریەکانی تێنەدەپەڕاند. سروشتی کۆمەڵگای کوردیش لە دۆخی ماتریال و کەرەستەیەکدا نەبوو بەدەستەواژەو تیۆری مۆدێرن روون بکرێتەوە. ئیرادەی شۆرشگێری دیاریکەرتربوو. لە ئایدیۆلۆژیا زیاتر، ژیانی ئازاد دەبووە سەرچاوەی ئیلهام. لەبەر ئەو هۆیە کاتێك سۆسیالیزمی بونیادنراو لەبەرچاوان کەوت زۆر کاریگەرنەبوو. لە پارتیەکی چەپڕەوی مۆدێرن زیاتر، لە بزووتنەوەیەك دەچوو کە لەسەر بنەمای ئەخلاق و باوەڕییە. تیۆریش هەبوو، بەڵام بەهای سەرەکی ئەخلاق و باوەڕی بوو. گرنگترین سەرمایەی کۆمەڵگای کوردەواری لەقۆناخی شەڕدا هەلومەرجە دژوارەکانی ژیانە کە هێزی ئەخلاق بوێری و خۆڕاگریەکەی دەستنیشان دەکردو هێشتاش هەبوونی خۆی پاراستووە. وەك نموونەکانی تر پەسەند نەکردنی مۆدێلی پارتیەکی چەپی مۆدێرن لەلایەن PKKوە دەبێ هۆکارێکی هەرە سەرەکی بێت کە هێشتا ئافرێنەرو پێگەیشتووە. ئەگەر هەر جیابوونەوەیەکی کە روویداوە، یان هەر زیانێکی بەریدەکەوت نەیتوانی رێگا لە پێشکەوتنەکەی بگرێت، لێرەدا هۆکاری هەرە گرنگ؛ خۆی بەشێوازی ژیان و مۆدێلی پارتی چەپڕەوی مۆدێرن رێکنەخست. بەتەنیا لەشێوەی PKKدا تەنیا کۆمەڵگا نەبوو بە خاوەن هەبوون، شانبەشانی راستینە کۆمەڵایەتییە ناکۆکەکەی، لەناوخۆشیدا لەمیانەی ئەو هێزەی ئازادی پێی دەبەخشێت شەڕێکی ناوخۆی خەستیشی بەڕێوەبرد. ئەو رەوشەی ململانێی ناوخۆ کە پارتیەکی مۆدێرن بەرگەی ناگرێت، لە پێشخستن و پتەوبوونیدا بەکاریگەربووە.
وەرچەرخانی بنەڕەتی PKKئەوکاتە روویدا کە لە رێڕەوی تەوەرەی دەوڵەت و ئامانجەکەی دەرکەوت، کەوتە سەر راستەڕێی پێکهاتەی دیموکراتی و سیاسی. گۆرینی رێڕەو بەهۆی سەختی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی سۆسیالیزمی بونیادنراو نەبوو. شێوازێکی ژیان کە لەو ژیانەی سەرمایەداری جیاوازتر نەبوو کە لە تەواوی جیهان لە ئارادابوو، هۆکاری سەرەکی داپرانبوو. یان ئەوەتا دەرفەتی ژیانی لە جیهانێکیتر دەدۆزیەوە، یان ئەویش وەك هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو پەرتەوازە دەبوو. کۆمەکی هەرە گرنگی قۆناخی ئیمرالی؛ ئەو رێگاچارە دیموکراتییەی لەدەرەوە بەشێوەیەکی سنووردار تاوتوێ دەکرا، بەقووڵی ئاواکرا. بەرگرینامەو لێدوانەکان، بە شێوەیەکی سەرنجراکێش قووڵایی رێگاکە پیشاندەدەن. دەوڵەت و PKK ش ماوەیەکی زۆر نەیانتوانی پێشکەوتنەکانی ئەو لایەنە تێبگەن، وەك گۆرانکاریەکی تاکتیکییان دەبینی. هەندێك کەسیش، وەك سەرەتای قۆناخی لەناوبردن لێی تێگەیشتن. کەچی لە راستیدا قووڵبوونەوەیەکی مەزن لەتیۆری سیاسی و زانستی سۆسیۆلۆژیا بەڕێوەدەچوو PKK .رووبەڕووی وەرچەرخانێکی زۆر بەرفراوان بوویەوە. ئەو کەسانەی لە هەستی بەرپرسیارێتی و ئەخلاق بێبەریبوون ئەو ساتەی وەرچەرخانیان بۆ خۆیان کردە بیانوی هەڵاتن و لەمەشدا دوودڵیان نەکرد. فاکتەری دیاریکەر لەو هەڵاتنانەی دوای"2000" روویاندا ئەو لاوازییە ئەخلاقیەبوو کە لەبەرامبەر جدیەتی وەرچەرخان لە ئارادابوو.

دەوڵەت و دەوروبەرە چەپرەوە پەیوەندیدارەکان لەو چاوەڕوانییە دابوون کە PKK بەخۆی خۆی لەناوببات. ئەوەش هەڵوێستێکی زۆر چەوت و نابەرپرسیارانەبوو. ئەگەر دەوڵەت دواتر بە بەرپرسیاریەتی نزیك ببوایەوە، لەوانەیە دوای ساڵی"1999" وەرچەرخانی دیموکراتیانەی مێژوویی روویدابوایە. لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی شایستە وەڵامی هەوڵە یەکلایەنەکان نەدرایەوە، لە راستیدا ئەوە بە فیرۆدانی دەرفەتێکی مێژوویی بوو. ئەو تاکڕەوێتییە لیبرالیەی هەڵوەرینی چەپ تێی کەوتبوو زۆر لە دەوڵەت بێ بەرپرسیارانەتر رەفتاریان کرد. ئەو هەڵاتنانەی روویدا هیچ بیانوویەکی ئەخلاقییان نەدەناسی. بۆ جارێکی دیکەو بە شێوەیەکی چاوەڕێنەکراو ئەو راستیەمان لە کۆمەڵگای کورددا بینی کە بۆ ماوەیەکی درێژ ناتوانن کۆمەڵگاکان بخەڵەتێنن. ئێش و ئازاری چەشتراو ئەزموونبەخش و فێرکەربوون. دڵسۆزیەکی ئاساییش بەسبوو تا کۆمەڵگا لەپێناو ئازادی و یەکێتی لەسەر پێیان بمێنێتەوە. ئەگەر وەك رێکخستنPKK ش لەناو بچێت کۆمەڵگایەك ئافرێنراوە، گەل و تاکێکی ئازاد ئاواکراوە کە لەپێناو ئازادی و سەرفرازی خۆی راپەڕێت.
وەك ئەنجام، کێشەی کورد چارەسەر نەکرابوو، بەڵام دەرفەتی چارەسەری تا دوایی زێدە ببوون. وەکو ئەوەی کۆمەڵگا لەسەر پێیان چاوەڕوانی چارەسەری بوو. هەرچەندە PKK وەك چۆن دەیەوێت ناتوانێت یەکلایەنە چارەسەری بەرەو پێشەوە ببات، بەڵام هەرچانسی چارەسەرکردن بە شێوەیەکی بەهێزتر بەردەوام بوو. ئیتر رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوە وەك مەرجێك لە ئارادا نەمابوو، بەڵام رێگا لەبەردەم چارەسەری دیموکراتی سیاسی زۆر دەوڵەمەند کراوەتەوە. چیتر دەوڵەتیش نەیدەتوانی رێگەچارە یەکلایەنەکانی خۆی داسەپێنێت. زۆرباش تێگەیشتبوو کە ئیتر ناتوانێت وەك رابردوو درێژە بە نکوڵیکردنی وشك بدات. ئیتر چارەسەری سەربازیش بۆتە شێوازێکی چارەسەری کە زیانەکەی لە سوودەکەی زیاترە. هەندێك جار هێزێکی زۆر و بێ رادە لەخاوەنەکەی دەداتەوە. بەو دۆخە گەیشتبوو. هاوشێوەی ئەو جیابوونەوەو داپرانەی لەناو PKK روویدا، لەناو دەوڵەتیشدا دەستی پێکردبوو. بۆ یەکەمجار بوو لەژێر ناوی ئەرگەنەکۆندا دەوڵەت بوێری دادگاییکردنی خۆی پیشاندەدا. کۆماری تورکیا بۆ جاری یەکەم کەوتە قۆناخی لێپرسینەوەی هەرە جدی مێژووی خۆی. ئیتر زۆرێك لەو راستیانەی نکۆڵیان لێدەکرا، باسیان دەکرێت.
بێگومان گرنگترین پەرەسەندنی ئەو قۆناخە نوێیە، دیداری ساڵی"2007" نێوان سەرۆکی ئەمریکاو سەرۆك وەزیری کۆماری تورکیا بوو کە ئێستاش ناوەڕۆکەکەی بەتەواوی نازانرێت. لەو دیدارەدا لەبەرامبەر لەناوبردنی خەباتی چەکداری PKK گەیشتنیان بوو بە بڕیاری کۆتایی هێنان بەشێوازی کۆنی بەڕێوەبەرایەتی گلادیۆ. دادگاییکردنەکانی ئەرگەنەکۆنیش گوزارشتە بەرجەستەکەیەتی. بە جۆرێك لە جۆرەکان بۆ ساڵی"1993" گەڕابوونەوە. بوێریەك دروست بوو کە لەهەڵەکانی "85" ساڵەیان بگەڕێنەوە. دامەزرێنەرە رەسەنەکانی کۆمار سەرلەنوێ بەیەکتری دەگەیشتنەوە. دیسان بە مێژوویەکی هەستیاردا تێپەڕ دەبوون. کوردە دابەشکراوەکان، خوازیاری یەکێتی و یەکپارچەیی بوون؛ هەمیش لەسەر بنەمای میساقی ـ میللییەکی نوژەنەوە. مێژوو رووبەڕووی ناهەقی و بێبەختی گەورە دەبێتەوە، بەڵام هەرگیز لەبیری ناکات. رۆژێك دێت بۆ تێپەڕاندنی ناهەقیەکان سەرلەنوێ لایەنەکان لە ژوانێکدا دەگەنە یەکتر. بێگومان چارەسەری بەدینەهاتووە، بەڵام کەوتوونەتە سەر رێی چارەسەری. هیوای چارەسەری کە لەئاسۆدا دەبینرێت، رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر دەبێت. کۆمار هێزی ئاواکردنی مۆدێلی دیموکراتی خۆی هەیە. ئەگەر خاوەندارێتی لە میراسی دەوڵەمەندی شارستانیەت بکرێت و شایستەی رۆحی یەکێتی بن کە راستی ئومەتبوون بەخشیوێتی، ئەوا ئەو پۆتانسێلە تەنیا بە پێشکەشکردنی مۆدێلی خۆی ناوەستێت، بەڵکو بۆ هەموو گەلە بێ چانسەکانی ناوچەکەش دەبێتە نموونەیەك. لێگەڕینەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، مۆدێلێکی دیموکراتی دەکات بە ئەگەرێکی دەستلێبەرنەدراو.

ج ـ ئەگەرەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد

لە سەرەتاکانی سەدەی"19" بەدواوە لەگەڵ جێگیربوونی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە رۆژهەڵاتی ناویندا، کێشەکانی کۆمەڵگا و ئەگەرەکانی چارەسەریشی گەیاندۆتە قۆناخێکی نوێ. کێشە و رێگەچارە تایبەتەکانی بە چاخەکانی یەکەم و ناوین ئەوجارە لەمیانەی گۆڕینی ناوەندەکەیەوە سەرلەنوێ لەلایەن شارستانیەتی هەژموونگەرایی رۆژئاواوە کە لە رێگای فاکتەری نوێوە شێوەی گرتووە بۆ رۆژەڤی مێژوو گواستراوەتەوە. کێشە گشتیەکانی رۆژهەڵاتی ناوین کە بە کێشەکانی "شەرقی"یش ناو دەبرێت لەناوەڕۆکدا دەتوانین وەك قۆناخی پارچەبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش پێناسەی بکەین، شانبەشانی تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی هەر کۆمەڵگا و گەل و نەتەوەیەك، لەمیانەی تایبەتمەندییە جیاوازەکانیشەوە کەوتە رۆژەڤەوە. لەسەرووی هەموویاندا عەرەب، عەجەم، تورك، کورد، ئەرمەنی، رۆم، سوورییانی و یەهودی لەسەر بنەمای ئایین و مەزهەبەکانیش لە سەرووی هەموویانەوە موسڵمان، کریستیانی، موسەویەتی و عەلمانیەت، هەروەها لەسەر بنەمای بوارە سەرەکیەکانی چینایەتی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی و سەربازیدا تا دەچوو خەستترو زیاتر دەبوون. ناوەڕۆك و شێوەی نوێ خرانە سەر کێشە کۆنەکان، ناوچەکە بە دۆخێك گەیشت کە بەردەوام لەناو قەیران، پێکدادان و شەڕدا بژیت یان خرایە رەوشێکی بەمجۆرەوە. باڵابوونێکی ریشەیی

شارستانیەتی رۆژئاوا جێگای باسبوو. ئەو باڵابوونەش چەندە تۆکمەتر دەبوو، خەستبوونەوەی کێشەو لێگەڕینەکانی چارەسەری لەناو هەموو وڵات، نەتەوەو کۆمەڵگاکاندا دەستلێبەرنەدراو بوو.
مێژوو هەر کاتێك تەنیا کێشە دروست ناکات؛ ئەو کات و شوێنانەی کە کێشەی تێدا دەژیت، ئەگەرەکانی چارەسەریش لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن. ئەوەی گرنگە گرێدراو بە هەلومەرجەکانی کات و شوێنەوە سەرچاوەی سەرەکی کێشەو ئەگەرەکانی چارەسەری، بەشێوەیەکی واقیعی پێناسەبکرێن و لەبواری کرداریدا جێبەجێ بکرێن. لەو پێناوەشدا گفتوگۆکردن و روونکردنەوەیەکی پێویست گرنگیەکی ژیانی هەیە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ئەو هەوڵانەی لەپێناو گفتوگۆو چارەسەری دەدرێن بە فیرۆ دەچن. لە دووسەد ساڵی دوایی هەژمووونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە لە راستینەی رۆژهەڵاتی ناویندا بەڕێوەچووە، تا رادەیەك شێوازی شەڕی کوێران بووە. لە دەرەنجامی بەرێوەبردنی سیاسەتە گشتیەکانی پەرتکە ـ زاڵبەوە تا دەگاتە پەیرەوو رێبازە جیاوازەکانی تەکتیکی رۆژانە بۆ پەرەپێدانی هەژموونگەرایی لەهەر گۆرەپانێکدا هیچ توێژو تاکێکی کۆمەڵگا نەماوە بە تۆرەکەوە نەبوویێت.
وڵاتی کوردستان و کۆمەڵگای کوردیش لەسەرووی ئەو وڵات و کۆمەڵگایانەوە دێت کە بەشێوەیەکی نەرێنیانە هەژمووونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کاریگەربووە، دابەشکراوەو لەرێگای کێشە، قڕکردن و یاخیبوونانەوە خنکێنراوە. کوردان و باوك و باپیرەکانی کە لە چاخەکانی سەرەتاو ناویندا وەك وڵات و کۆمەڵگا بە قۆناخی هاوشێوەدا تێپەڕیون، لەپاڵ ئەو سەرکوتکردن و چەوسانەوەی لە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دووچاری هاتن، بۆ یەکەمجار کەوتنە قۆناخێکەوە کە هەبوونیان بە شێوەیەکی جدی و سیستەماتیك کەوتۆتە ژێر مەترسی و هەڕەشەوە. ئەو قۆناخەی تێیکەوتووە، قۆناخێکی مەترسیدار بوو کە بە شێوەیەکی بەرچاو قڕکردنی کلتووری و جەستەیی تێدا پەیرەو دەکرێت. لەناو ئەو چوارچێوە گشتیەدا، هاوتەریب لەگەڵ پەرەسەندنی کێشەی کوردو کوردستان، ئەگەرەکانی چارەسەریش کە بەردەوام لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی، پەرەسەندن و وەرچەرخانی بەخۆوە دیوە.
دەکرێت پەرەسەندن و وەرچەرخانەکان لەژێر سێ شێوەی سەرەکیدا هەڵسەنگێنین.

1ـ رێگەچارەی قڕکردنی نەتەوەیی هەژمووونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

ئەو شێوازەی چارەسەری ئەوپەڕگەرترین شێوازی چارەسەری پشتبەستوو بە توندوتیژییە لە کۆڵۆنی و مەترەپۆلەکانی سیستەمی سەرمایەداریدا. هەرسێ فاکتەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پاوانخوازی دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی، لەبەر ئەوەی مۆدێلێکی کۆمەڵگای هۆمۆژەن لەبونیادی هەر کۆمەڵگایەکی نەتەوەییدا دروستدەکات کە دەچێتە ناویەوە، بەردەوام پێویستی بە بەسەرکردنەوەی سیاسەتی نکوڵیکردن و قڕکردن دەبینێت. ئەو سیاسەتە یاخود شێوازی ئیدارەکردنە، بەگوێرەی بەرخودانی دیاردە کۆمەڵایەتیەکەی بەرامبەری دەکرێت شێوەی جیاواز وەربگرێت. ئەگەر بخوازێت بوونی کۆمەڵگای بەرامبەر لەناو ببات و لەناو فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆیدا بیتوێنێتەوە، لەوانەیە ئاستی توندوتیژی بە جینۆسایدیش بگات. ئەو کۆمەڵگایەی کراوە بە ئامانج هەندێك جار، لە وڵاتی خۆیان بەرەو جوگرافیایەکی ئابلۆقەدراو بۆ ئەو هەرێمانە دووردەخرێنەوە کە بەئاسانی ئاسیمیلاسیۆنی تێدا ئەنجامدەدرێت. دوورخستنەوە لە لادێ و ناوچە شاخاویەکان بۆ شارەکان، شێوەیەکی دیکەی توندوتیژییە. کۆمەڵگا زۆرەملێکان، زیندان و کۆمەڵکوژی کردەوەگەلێکن کە توندوتیژی تێدا چڕتر بۆتەوە. دابەشکردن و پارچەکردنی وڵاتی دایکیشیان، شێوەیەکی دیکەی توندوتیژییە کە بە ئامانجی بەرێوەبردنێکی ئاسانتر پەیرەو دەکرێت. ئەو رەفتارو کردەوەگەلە زۆرەملێ و گونجێنراوەکانی ئاسیمیلاسیۆن دەکەوێتە پۆلێنی توندوتیژیەوە. ئۆپەراسیۆن، رووبەرووکردنەوەی بێکاری و دۆخی ناتەندروست و بێتەندروستی کردن، هەموو جۆرە قەدەخەکاریەك، سوغرەو کاروخەباتی سەخت، شێوە سیستەماتیکەکانی توندوتیژین کە بەردەوام دەستبەکارن. وێرای ئەمانەش ئەگەر ئەو جفات یان کۆمەڵگایانەی کە بە ئامانجگیراون، لەسەر پێیان بمێننەوەو مسۆگەر لەناوبردنیان پێویست بێت، ئەوا قڕکردنی کلتووری بە قڕکردنی جەستەیی تەواو دەکرێت.
کوردو کوردستان لە رۆژهەڵاتی ناوین لەلایەن فاکتەرە جیاوازەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بەرێوەبەرە پاوانخوازەکانیان و بەتایبەتیش لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە، لە هەلومەرجی کات و شوێنی جیاوازدا دووچاری ئەو هەموو شێوە ئاماژە پێکراوانەی توندوتیژی هاتوون. تەنیا بەستنەوەی ئەو کردەوانە بە بەرێوەبەرایەتییە سەرەڕۆو دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورك، عەجەم و عەرەبەوە هەڵوێستێکی ناتەواو دەبێت. ئەگەر هەژمووونگەرایی ناوەندی سەرمایەداری لەسەر کار نەبێت، هیچ دەسەڵاتێکی سەرەڕۆ یان دەوڵەت ـ نەتەوەیەك ئەو هێزەی نییە کە توندوتیژی لەناوبردنی نەتەوەیەك بەرێوەبات. تا سیستەم رێگا نەدات، خوازیاریش بێت ناتوانێت ئەو هێزە نیشانبدات، ئەگەر پیشانیش بدات ناتوانێت بیکاتە هەمیشەیی. لە سەرەتای سەدەی"19"وە تاکو"1945" ئیمپراتۆریەتی بەریتانی لەهەموو شاڵاوە لەناوبەرەکانی سەر کوردو کوردستان، کۆمەڵکوژی و پارچەبوونەکاندا، لە پراکتیکە تایبەتەکانی داگیرکاری دەوڵەت ـ نەتەوەکانی هەرێمەکە "تورك، ئێران

و عەرەب،"دا لایەن بووە. ئەگەر بەریتانیاو هێزە هەژموونگەراکانی تر نەبوونایە، ئەوا پێگەی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی کوردو کوردستان نەخشەی بۆ نەدەکێشراو جێبەجێش نەدەکرا. بەڵام ئەوە بەومانایەش نایەت کە هەموو بەرپرسیارێتیەك هی شارەگەورە ئیمپریالیستیەکانە؛ فاکتەرە خۆجێییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە لەچوارچێوەی سیستەمەکەیاندا ئاواکراون، قەوارەی دڕندەترو لەناوبەرترن. ئەوەی ئەوانی خستۆتە ئەو رەوشەوە، شێوازی کۆنەپەرست و فاشیستانەی دەوڵەتی، دەوڵەت ـ نەتەوەو پیشەسازیگەراییە. لەبەرئەوەی درەنگ وەخت ئاشنای مۆدێرینیستی سەرمایەداری بوون و توانستی کلتوورییان لاوازە، زیاتر ئەو فاکتەرانە ناچاری بەڕێوەبەرایەتی قڕکردن و نکۆڵیکاری نەتەوەیی دەبات. لەبەرئەوەی سەرمایەداری پەیرەوکراو بە شێوەی پاوانخوازی دەوڵەت پەرە دەسەنێت، تاڵانکارو زەوتکارە، هەروەها چونکە بەبێ پەرەپێدانی کرێکاری مووچەدار چەوسانەوەو بەدەستهێنانی قازانج بەبنەمادەگرێت، ناچارە بەو شێوەیە بەڕێوەی ببات.
پەیرەوکردنی هەمان شێواز بەسەر کەرتی تایبەتیشدا دەسەپێنێت کە درەوشاندویەتیەوە. ئاشکرایە کە شێوەی تایبەت و کەرتی تایبەتی سەرمایەداری تا قڕکردن و ئاسیمیلاسیۆنی زۆرەملێیانە نەخاتەگەڕ بەئاسانی جێبەجێ ناکرێت. خۆی لە خۆیدا دەوڵەت ـ نەتەوە لە پێگەی مەزنترین کارسازی سەرمایەداری دایە. پێناسەکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە وەك چڕترین و رێکخراوترین شێوەی سەرمایەداری سەبارەت بە تێگەیشتنی قۆناخەکە گرنگیەکی دیاریکەری هەیە. "ئەندازیاریەتی کۆمەڵگای" دەوڵەت ـ نەتەوە، وەك چەرخێکی هۆمۆژەنکردنی سەرتاسەری ئەتنیکی نەتەوەی دەسەڵاتدار، تا ئەو توێژانە لەناو دەبات کە کراون بە ئەویتر، ئەوا بەشێوەیەکی بێزەییانە بەردەوام دەبێت. تەواوی دەوڵەت ـ نەتەوە عەرەب، تورك و عەجەمەکانی لەسەر کوردو کوردستان ئاواکراون، ئەو کارەیان لێ بارکراوە.
پێویستە پیشەسازیگەراییش وەك کردارێکی پاوانخوازی قڕکردنی نەتەوەیی دەرکی پێبکرێت. رووخاندنی کۆمەڵگای کشتوکاڵ و گوند، لە سەرووی گەورەترین کردەوەگەلەکانی قڕکردنی کۆمەڵگا لەلایەن مۆدێرنیتەوە دێت. پیشەسازیگەرایی پشتبەستوو بە وزەی ئاو، خەلووز و ئەتۆم کە سەرەڕای دەوڵەمەندێتییە کلتوورییەکان رێگای لە پێش چۆڵکردنی هەزاران ناوچەی نیشتەجێبوون کردۆتەوە، ژینگەی پیس کردووە، ژهراوی کردووە، رووبەڕووی رادیۆئاکتیفی کردۆتەوەو هاوسەنگی سروشتی تێکداوە، لە جینۆساید بەولاتر سەرچاوەیەکی هەڕەشەیە. وێرانکردن و تاڵانکردنی پاشماوە مێژووییەکانی کوردستان، گوزارشت نەکردنی ئازادانەی کوردان بۆ کلتوورەکەیان، قەدەخەکاریەکانی سەر بەها کلتووریەکان و نەبوونی ئازادی خۆ پەروەردەکردن ئاماژە بەو لایەنانەی قڕکردنی کلتووری دەکەن کە بەلای کەمەوە ئەوندەی قڕکردنی جەستەیی مەترسیدارە.
ئەو شێوازە دڕندایەتییە کۆمەڵایەتییەی چارەسەری سەربازی یانیش بە چارەسەری هێز ناودەبرێت، گرێدراوی داروینیزمی پۆزیتیڤیستە. داروینیزمی پۆزیتیڤیستیش مافی ژیانی خاوەن هێزەکان بەبنەما دەگرێت. کورد لە سەرووی ئەو کۆمەڵگایانەوە دێت کە تا مۆخی ئێسقانیان لەناو چارەسەری قڕکردن و سەرکوتکەرانەی دەسەڵاتدارانی هێزی سەربازیدا ژیاوە کە پشت بە فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەبەستن. ئەرمەنی، رۆم، سوریانی، بەدەوی و تورکمانەکانیش ببوونە قوربانی رێگەچارەی هاوشێوە. ئافراندنی نەتەوەیەکی دەسەڵاتداری هۆمۆژەن بەتەواوی ماڵوێرانییە. هەر نەتەوەیەکی هۆمۆژەن (لێکچوو) مانای لەناوبردنی هەزاران بەهای کلتووری دێت. ئەو بەرخودان و سەرهەڵدانانەی لەپێناو بەرگریکردن لە هەبوون و کەرامەت لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بەتایبەتیش لەبەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە ئەنجامدراون، بەهۆی لاسەنگی هێزەوە بەگشتی بەکۆمەڵکوژی ئەنجامگیربووە. هەر کۆمەڵکوژیەك بە هەنگاوێکی رێگەچارەی سەربازی دانراوە. دوای دابەشکردنی کوردستان لە رێگای رێکەوتنی قەسری شیرین "1639"، سەرەڕای میساقی میللیش ئەو پارچەبوونەی هاتە ئاراوە کارەساتەکەی گەورەتر کردووە، رێگای لەپێش پەیرەوکردنی زیاتری رێگەچارەی سەربازی کردۆتەوە. نزیکەی"90" ساڵا هەر پارچەیەکی کوردستان کراوەتە تەختەیەکی تاقیکردنەوەی رێگەچارەی سەربازی. تێڕوانینی"کوردی دڕندەو کۆنەپەرست" بەئەنقەست هەڵبەستراوە، کردوویانەتە بیانووی سەرکوتکردن و هێرشەکانی لەناوبردن.
بۆرژوازی چینی ناوین و بیروکراسی کە لەلایەن فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەوە ئاواکراون ئەو هێزە کۆمەڵایەتییە سەرەکیەن کە لەپشت رێگەچارەی هێزی سەربازیەوەن. ئەو چینە چاوەکانی خۆی لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەکوردان کردۆتەوە. رێگای گەورەبوونیشیان، بە چەوساندنەوەی داگیرکردنی کوردان و رژاندنی خوێنیاندا تێپەڕ دەبێت. کوردو کوردستان بە سەرچاوەی کەرەستەی خاوی سروشتی ئەو چینە دادەنرێت. هیچ کاتێك بەهای سۆبژەیان پێنادرێت؛ بەردەوام لە پێگەی ئۆبژە، لە دۆخی کۆیلایەتیدا دەهێڵرێتەوە کە لە رەوشی ژن خراپترە. دەرکەوتنیان لەبەرامبەر هێزە هەژموونگەراکانی رۆژئاوا کە سیاسەتێکی داگیرکەری خاوتر بەڕێوەدەبن، بەهۆی ئەشقیان بۆ سەربەخۆیی و ئازادی نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بتوانن کەرەستە خاوەکە لەدەستیان دەربێنن و لەهەلومەرجی گونجاوتردا بەڕێوەی ببەن، واتە بەهۆی ئەو ترسەیانە نەوەك لە بەرامبەریان بەکاربهێنرێت.
لە ساڵی"1920" بەدواوە، لە ژێر سێبەری هەژموونگەرایی رۆژئاواو لە بەرامبەر ئەو قەرەبوانەی بەو هێزانە دراوە، بەشێوەیەکی نادیارو داخراو رێکەوتنێکی چوار قۆڵی لەسەر کوردو کوردستان جێگای باسە. هەژموونگەرایی رۆژئاوا بەو ئامانجەی هەر چوار دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوچەکە "ئێران، تورکیا، سوریا، ئێراق" وەك چۆن دەیانەوێت ئاراستەیان بکەن، لەژێر پەردەوە یاریکردنیان بە کوردو کوردستان، بۆ خۆیان کردووە بە مەعریفەتێك. لە رووخساردا خۆیان بە پشتیوان پیشاندەدەن، بەڵام دوای گەیشتن بە ئامانجەکانیان، پشت تێکردنیان بە گوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەبینن. ئەوەندە هێزی سەربازی و پیلان و گەلەکۆمە لەسەر هیچ گەلێکی

جیهان و وڵاتێك ئەنجامنەدراوە. ئەرمەنی، رۆم و سوریانیەکانیش ببوونە قوربانی ئەوجۆرە کردارو رەفتارانەی مۆدێرنیتە. دوای رووخاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق لە ساڵی"2003"دا حوکمڕانانی سوریا، ئێران و تورکیای خستە ناو ترسەوە؛ بۆیەش سەرجەم ناکۆکی و گیروگرفتەکانی نێوان خۆیان بەلاوەنا، تەنانەت برایەتی ئایینیشیان لەبیر کرد کە زۆر باسیان دەکرد، رێکەوتنە پیرۆزەکانی خۆیان بەرامبەر کوردان نوێکردەوە. ئەو هێزانە بەخێرایی و بێ دوودڵی ئەو رێکەوتنانەیان لە بەرامبەر کوردو کوردستان پێشخست کە نەیانتوانیوە لەبەرامبەر هیچ دوژمنێکیان پێشیبخەن.
لەگەڵ ئەوەی کوردان بەبێ پارێزەرو هاوپەیمان لەبەرامبەر هەژموونگەرایی کەڵەکەبوو راپەڕیون، وەك گەلە هاوسەردەمەکانیان نەیانتوانیوە رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوەو رێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات پێشبخەن. هەرچەندە رووخاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق رێگای بۆ هەندێك لە هێزە کوردەکان کردۆتەوە کە بە ئاراستەی رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوە هەنگاو بۆ قەوارەی دەوڵەتێکی فیدراڵی بهاوێژن، بەڵام لە دۆخێکی پارێزراوو ئاساییشیدا نییە. ئەو قەوارەیە مانای رزگاربوونی کوردان نییە، بەڵکو هێزە داگیرکەرو هەژموونگەراکان خوازیارن وەك ئامرازێکی کۆنترۆڵکردن بەکاریبێنن. لەگەڵا ئەوەی رێگەچارەی سەربازی و سیاسەتی هێز لەسەر هەر پارچەیەکی کوردستان و خەڵکەکەی، دەستبەرداری بانگەشەی گەیشتنە بە ئامانجە نەریتیەکانیان نەبووین، بەڵام ئیتر خاوەن هێزی رابردووش نیین. لەبەر ئەوەی زۆر ئاشکرابووە، ئیتر بەخێرایی بنەماکانی نۆکەرایەتیش لەدەستدەدات. لەگەڵا ئەوەی ئەو توێژە کۆمەڵایەتیەیە کە رێگەچارەی هێزی سەربازی دەوڵەت ـ نەتەوە پشتی پێدەبەستێت، لە ئاکامی بەرخودانی ئەو سی ساڵەی دوایی دەمامکی کوردە بەکرێگیراوە نەریتیەکان باشتر لادراوە، ئەوانیش ئاشکراو ریسوابوونە. ئەو داماڵین و سووانەی لە بناخەی کۆمەڵایەتی بەکرێگیراوێتیدا روویداوە رۆڵێکی گەورەی هەیە لە لاوازبوونی رێگەچارەی سەربازیدا.
لەگەڵا جێگیربوونی هەژموونگەرایی ئەمریکا لە ئێراق، زەمینەی بەردەوامکردنی شێوازە نەریتیەکانی گلادیۆی ناتۆ لەسەر کوردو کوردستان، واتە زەمینەی شێوە کۆنەکانی کۆنتر گەریلا تێکچوو. ئەو ئاڵۆزیەی لەبەر هەڵوێست لەبەرامبەر PKK و دەوڵەتی فیدراڵی کورد لە نێوان کۆماری تورکیا و ئەمریکا لە ئارادابوو لەمیانەی رێکەوتنی واشنتۆنی ساڵی"2007" بە قۆناخێکی نوێ گەیشت. وەك دەبینرێت لەبەرامبەر دەستبەردانی PKK لە خەباتی چەکداریەوە، بە رێکەوتنێکی گشتی گەیشتوون کە رۆڵێکی سەرەکی نادات ە رێگەچارەی سەربازی، بەڵکو لەژێر بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەدا رێگەچارەی رەهەندەکانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری و کلتووریش پێشنیاردەکات. دادگاییکردنەکانی ئەرگەنەکۆن پەیوەندی بەو رێکەوتنەوە هەیە. پێویستە پشکی ئەو رێککەوتنە لە ئاساییبوونی پەیوەندی لەگەڵا دەوڵەتی فیدراڵی کورددا ببینرێت. بەمشێوەیە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورك ناچاربوو گۆڕانکاری بەسەر کردەوەکانی دەرهەق بە کوردو کوردستاندا بهێنێت. هەردوو کۆڵەکەکەی تری مۆدێرنیتە، رێژە سنوردارەکانی قازانجی سەرمایەو بەرژەوەندیەکانی پیشەسازیگەرایی لەسەر ئابووری ئێراقیش، لێرەدا زۆر بەکاریگەر بوو. سیاسەتی نوێی کۆماری تورکیا سەبارەت بە کوردو کوردستان ، چیتر ئەولەویەت بە رێگەچارەی سەربازی نادات، بەرەو سیاسەتێك هەنگاوی ناوە کە لە گۆڕەپانەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و کلتورییەوە بۆ رێکەوتن کراوەیە. هەڵبەتە ئەمەش پەرەسەندنێکی گرنگە؛ پێشکەوتنێکە کە کاریگەری لەسەر هەموو کوردو کوردستانە، لەو سۆنگەیەوە کاریگەری لەسەر هەموو رۆژهەڵاتی ناوین هەیە، ئەمەش دەرەنجامی گرنگ لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

## 2ـ رێگەچارەی فیدراڵیانەی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد

ئەو رێگەچارەیەی پشتدەبەستێت بە باشووری کوردستان و کوردەکانی ئەوێ، لە بنەڕەتدا رەنگدانەوەی شێوازی رێگەچارەی هێزە هەژموونگەراکانی رۆژئاوایە. لەبەر ئەوەی ئەو هێزانە لە سەرکەوتنی درێژخایەنی رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوە خۆجێییە فاشیستەکان دڵنیانین، هەروەها بۆ جێگیربوونیان لەناوچەکەدا گونجاو نییە، رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوەی فیدراڵا ناچارییە. بەو شێوەیە هەم لە جێگیربوون لە وڵاتە پەیوەندیدارەکان و هەم بۆ بەخۆوە گرێدانی لە دەوڵەت ـ نەتەوە خۆجێییەکان و فاکتەرەکانی تری مۆدێرنیتەو پەرەپێدانیان؛ ئەو رێگەچارەیەی پشتدەبەستێت بەکوردەکانی باشوور، رۆڵی دڵنیاکەرترین نوێل دەبینێت. هەربۆیەش دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی تەواو سەربەخۆ گونجاو نابینن، چونکە ناتوانێت رۆڵی هەمان نوێل ببینێت، وەك بژارێك نابینرێت. مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش بەهۆی ریسوابوونی سیاسەتەکانی بەکرێگیراوێتی نەریتییان بێت، یاخود چیتر بەرژەوەندیەکانیان دابین ناکات، ئەوانیش وەرچەرخانێکیان بەرەو چارەسەری فیدراڵیانە پێویست بینی. پێویستە دەوڵەتە فیدراڵیيە کوردیەکەی باکوری ئێراق "باشووری کوردستان" تەنیا وەك وەرچەرخانی بۆرژوازیانەی ئەو هەرێمە نەبینرێت، بەڵکو پێویستە وەك وەرچەرخانێکی بۆرژوازیانەی چینی بەکرێگیراوی تەواوی کوردستان هەڵسەنگێندرێت. رەگو ریشەیەکی کۆنی هەیە. لە هەموو راپەرینەکان و رێکخستنە میللیگەراکاندا، ئەو رێگەچارەیە وەك ئامانجێك دەستنیشانکراوە. سەرەڕای دۆخی پارچەبوون و پەرتەوازەیی نێوانیشیان، دەشێت پێگەی نوێی ئەو هێزانە وەك مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کورد هەڵسەنگێنرێت.

بەتایبەتی بەرخودانی"30" ساڵی دواییPKK ، ئەوانیشی ناچار کردووە هاوکاری یەکتر بکەن و بە دوای لێگەڕینی رێگەچارەی فیدڕالیانەوە بن. هەرچەندە پەرتەوازەو چەند سەرەش بن و لەئاستی سیاسی ـ ئایدیۆلۆژیدا لاوازیش بن، بەڵام لە چوارچێوەی نیمچە دەوڵەت ـ نەتەوەی فیدراڵی پێداگری لەسەر شێوازی چارەسەری خۆیان دەکەن. هەرچەند دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچە "تورکیا، ئێران، سوریا، دەوڵەتی ناوەندی ئێراقیش" لەدژی بوەستن، بەڵام ئەگەرێکی بەهێزە بەپشتگیری هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانگیری هەبوونەکەیان هەمیشەیی بکەن. هەژموونگەرایی جیهانگیری پەیرەوکردنی ئەو مۆدێلەی چارەسەری وەك مۆدێلێك بۆ تەواوی رۆژهەڵاتی ناوین، بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی گونجاوتر دەبینێت. چارەنووسی رێگەچارەی فیدراڵیانە، گرێدراوی راست تێگەیشتنی بیروکراسی و بۆرژوازی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتە سەبارەت بە ناسنامەی کورد و رێزلێنانی ئەم ناسنامەیە. وەك دەبینین ئەزموونی ئێراق هێشتا بەو قۆناخە نەگەیشتووە. هەڵوێستی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەبی سوریاش کوردان لەدەرەوەی کۆمەڵگای دەوڵەت دادەنێت. تەنانەت کوردان وەك هاوڵاتیش پەسەند ناکات. میللیگەرایی وشکی شیعەی ئێرانیش، لەبەرامبەر دیاردەی کورد نامۆیەو بۆ توانەوەی کوردانیش لەبارە. پشت ئەستورکردنی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی نەریتیش بەفاکتەرەکانی ئەو شێوە مۆدێلەش کاتی دەوێت. ئەو بەڕێوەبەرایەتیەی ئێستاکە دووری فیدرالیزمە. لەوانەیە رزگاربوونی بۆرژوازی چینی ناوین و بیرۆکراسیەتی تورك لە هزری نکۆڵیکارو ئاسیمیلاسیۆنیست زووتر ئەنجامگیربێت. لەبەر ئەوەی زۆربەی جەماوەری کورد لە کۆماردا و لە پێکهاتەکانی پێشووتری دەوڵەتیشدا هاوکاریەکی زۆری چینی سەرووی تورکی کردووە، لەوانەیە رێگا لەبەردەم شۆرشێکی هزری بکاتەوە.
لەراستیدا بە بیرهاتنەوەی هاوبەشێتییە ستراتیژیەکانی قۆناخی دامەزراندنی کۆمار زەحمەت نییە. کاتێك تێگەیشتنێکی راست سەبارەت مێژووی هاوبەش جێگای باس بێت، ئەوا پەرەسەندنی کوردانیش لە بونیادی دەوڵەتدا دەست لێبەرنەدراوە. تورکەکان وەك میللەت زۆرجار لە قۆناخە هەستیارەکاندا تاقیانکردۆتەوە کە بێ کورد دووچاری ماڵوێرانیەکی ستراتیژیك دەبنەوە. لە قۆناخی ئاساییدا ئەگەر فیدراڵیش نەبێت، تەنانەت لەو دۆخەی پەسەندکردنیشدا ئەزموونی ژیانی هاوبەش زەحمەت نییە. دەشێت ئەو تێکەڵبوونەی نێوان کۆمەڵگا وەك لایەنێکی ئەرێنی خزمەتکردن بە ژیانی هاوبەش هەڵسەنگێندرێت. ئەگەر ریسوابوونی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرست و میللیگەراو رەگ و ریشە مێژوویی و قووڵەکانی چەمکی ئومەت ـ میللەت بەلایەنی دیموکراسی موحافەزەکاردا بەکاربهێندرێت، ئەوا بەکرێگیراوە کوردە کلاسیکەکانیش ئەو ریزانە هەڵدەبژێرن. ئەو واقیعەی بەڕێوەش دەچێت بەو لایەنەوەیە. هەرچەندە بەردەوام رێگەچارەی سەربازی لە ئامادەباشیدا بێت، بەلایەنی کەمەوە دەشێت لە چوارچێوەی ئازادی فیکردا گفتوگۆ لەبارەی فیدرالیزمەوە بکرێت.
هەم رێگەچارەی هێزی سەربازی، هەم رێگەچارەی بەکرێگیراوێتی فیدراڵی هەردووکیان چوارچێوەی کۆمەڵایەتییان بەرتەسکە. چارەسەریەك نییە لە بەرژەوەندی کوردان و کۆمەڵگای دراوسێکاندا بێت. ئەو مۆدێلانە رەنگدانەوەی رێگەچارەی رێککەوتنی چینی سەروو و فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نیشاندەدەن. ئەوەندەی لە توێژی خوارەوەی کۆمەڵگا بترسێن، زیاتر نزیکی پێویستی چارەسەری دەبنەوە. ئەو چارەسەریەی کە لەهەموو بزووتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانیەکان و سەندیکاگەراییەکانی چینی کرێکار بەڕێوەدەچێت، رێگەچارەی چینی ناوینە. چارەسەرنەکردنی ئەو کێشانەی لەئارادان، گرێدراوی ئەو بونیادە چینایەتیەیە. چونکە هەر چینێك توانستێکی چارەسەری هەیە. لە چارەسەری ریشەیی کێشەکانی کۆمەڵگادا، پێویستە فاکتەرەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی دەرەوەی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بکەونەگەڕو رۆڵی مێژوویی خۆیان ببینن. مێژوو پۆتانسێلی پێویست پێشکەش بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کوردی ناکات. لێگەڕینەکانی رێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوە هێزی دەربازکردنی فیدرالیزمی نییە. فیدرالیزمیش بەتەنیا بۆ چارەسەری کێشەکانی کۆمەڵگای کورد بەش ناکات کە بەردەوام لەناو قەیراندایە؛ دەتوانێت لە رێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتیدا رۆڵێکی باش ببینێت و ئەو مەترسیانە بەلاوە بنێت کە لە کەموکوریەکانیەوە سەریهەڵداوە.

### 3ـ رێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات

تایبەتمەندی دیاری رێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات، لە دەرەوەی دەوڵەت بە دوای چارەسەریدا دەگەڕێت. گەڕان لە دەرەوەی دەوڵەت نە مانای رووخاندنی دەوڵەت و ئاواکردنی دەوڵەتێکی تر لە شوێنیدا دێت، نە وەك پاشکۆیەکی دەوڵەت مانای توانەوە لەناویدا دێت. کۆمەڵگا لە ناوخۆیدا، واتە لەناو ئیرادەی دیموکراتیانەی خۆیدا لە چارەسەری دەگەڕێت. بەباش و بە خراپ دەوڵەت ناکاتە ئامانجی خۆی. چونکە لە راستیدا لە مێژووی تەواوی شارستانیەت و قۆناخی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا، چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگاو بەرژەوەندیەکانی چینی سەرووی بە دەوڵەتبوونەوە گرێدراوە. دیمۆس ئەگەری رێگەچارەیەکی بەمجۆرەی نابێت. رێگەچارەی دەوڵەتی پرۆلیتاریا یان دەوڵەتی گەل کە سۆسیالیزمی بونیادنراو بەناوی رەنجدەران و گەلان پێشنیاری دەکات، لەخشتە بردن و فریودانە. ژیانیش ئەو راستییەی سەلماندووە. ئەو شەڕانەی لەپێناو دەسەڵاتدارێتی و دەوڵەتبوون بەڕێوەچوون، بەردەوام بۆ بەرژەوەندی نوخبەو سەرمایە بووە. بەهۆی بەرژەوەندی نوخبەی دەسەڵات

و پاوانەکانی دەسەڵات بە درێژایی مێژوو ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتی پێشنەخراوە. هەمان راستی لەچارەسەرکردنی کێشەکانی ڕۆژی ئەمڕۆشماندا جێگای باسە.
ئەو PKK یەی لەژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراو دابوو ماوەیەکی درێژ نەیتوانی پارادیگمای دەوڵەت ـ نەتەوە دەربازبکات، هۆکاری بنەڕەتی چەقبەستبوونەکەی بوو. ئەو ڕەوشەش لەچەقبەستبوونی کۆماری تورکیا دەچێت لەلایەن فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە. ئامانج وەرچەرخانی تورکیا بوو بۆ دەوڵەتێکی سۆسیالیست، ئاواکردنی کۆمارێکی سۆسیالیستی لە کوردستان و دواتریش ئاواکردنی یەکێتیەکی ئەنتەرناسیۆنالیستی لەنێوان هەردووکیاندا بوو. لەو پارادیگمایەدا جێگایەکی ئەوتۆ بۆ دیموکراسیەت و کۆمەڵگای دیموکراتی نەبوو. ناکۆکییە چینایەتیەکانی ناو سروشتی دەسەڵات و دەوڵەت نەدەبینران. وەك چۆن مارکس بڕوای بە ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی ساف سەرمایەداری هەبوو، بڕوا بە ئاواکردنی دەوڵەتێکی چینایەتی ساف کرابوو. کەچی لەراستیدا لە بواری دیاردەییدا نە دەوڵەتێکی ساف چینایەتی و نە کۆمەڵگایەکی ساف سەرمایەداری هەردووکیشیان ناکرێت و نابێت. لەو لایەنەوە هەندێك ڕەخنەی ئەنارشیستەکان مافدارو راستیش بێت، بەڵام ئەوانیش سەبارەت بە ئامانجی کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتی هەمان ئاراستەی راستیان درێژە پێنەدەدا.
پرۆسەی تێگەیشتنی PKK لە کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتی بەئێش و ئازاربوو. لەهەمانکاتیشدا سەرلەنوێ لەدایکبوونەوەیە. ڕەتکردنەوەی پارتیەکی سۆسیالیستی بونیادنراوی کلاسیکە. وازهێنانە لە ئامانجی دەوڵەتبوون. لەسەرووی ئەو پارتیانەوە دێت کە لەولایەنەوە وەرچەرخانیان ئەنجامداوە.
ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات، تەنیا وەك ئەگەرێکی ڕێگەچارەی تایبەت بە گەلی کوردو کوردستانەوە پێشنیار ناکرێت. وەك ڕێگەچارەیەکی گەردوونی بۆ سەرجەم کۆمەڵگاکان، لە سەرووشیانەوە بۆ کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین پێشنیار دەکرێت. کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کۆمەڵگای مەدەنی چەتری سیاسی ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتییە، کە دەوڵەت نییە. کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ فیدرالیزم و کۆنفیدرالیزمی دەوڵەتیەوە نییە. ئەوانە دیاردەی جیاوازن.
مۆدیلی ئابووری ـ کۆمەڵایەتی ڕێگەچارەی نەتەوەیی دیموکراتی، یەکینە کۆمیناڵەکانن. یەکینەکانی کۆمەڵگای ژینگەپارێزی، کۆمەڵایەتی و ئابووری، ئامانجیان بەدەستهێنانی قازانج نییە. بەڵکو ریزبەندی پێداویستییە بنەڕەتیەکان مەرجە. ئەگەر بازاڕیش هەبێ، بەڵام پاوانگەرایی سەری سنووردارکراوەو لەژێر کۆنترۆڵی ئەخلاقی کۆمەڵگادایە. بەها ئەخلاقی و سیاسیەکانی ناو کۆمەڵگا، لەپێش یاساوە دێت. لە کۆمەڵگای حقوقی زیاتر، بنەماکانی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی لەپێشترە. لە تاوتوێکردنی کارو کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا پێوەرەکانی دیموکراسی راستەوخۆ پەیڕەو دەکرێت. دیموکراسیەتی راستەوخۆ گرێدراوی رادەی تێگەیشتنی زانستیانەی سەردەمە. ئازادی کۆمەڵگا و تاك لەمیانەی بەرجەستەکردنی هاوبەشی تێگەیشتنی زانستی، هونەر، ئەخلاقی و سیاسیەوە بەدیدێت. پێوەری تاکی ئازاد، گرێدراوی ئاستی ئازادی ئەو یەکینە کۆمیناڵانەیە کەجێگای خۆی تێدا دەگرێت. داپران لە کۆمەڵگا مانای ئازادی نابەخشێت.
لەپاڵ ئەو تایبەتمەندییە گشتیانە، دەتوانین سەرلەنوێ هەندێك پرەنسیپی سەرەکی ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات ریزبکەین.

أ ـ نەتەوەی دیموکرات: گوزارشت لە دۆخی نەتەوەی کۆمەڵگای دیموکراتی دەکات کەپشت نابەستێت بە زمان، ئەتنیك، چین و دەوڵەت، جێگا بە جیاوازی چینایەتی و جیاکاری دەوڵەت نادات، بەڵکو پشت بە تاکی ئازادو یەکسان دەبەستێت. نەتەوەی دیموکرات لە هاوڵاتیان و جڤاتی دیموکرات پێکدێت. پارادیگمای نەتەوەی میانڕەو بە بنەما دەگرێت کەلە ناسنامە کلتوورییە کراوەکان پێکدێت.
ب ـ نیشتیمانی هاوبەش" وڵاتی دیموکراتی": گوزارشت لە کۆی وڵاتی دایك دەکات کە هیچ کەس ئەوەی بەرامبەری، هیچ کۆمەڵگایەکیش کۆمەڵگاکەی بەرامبەر ناکات بە ئەویتر، بەڵکو بەشێوەیەکی ئازاد و یەکسان هاوبەشێتی تێدا دەکرێت.

ج ـ کۆماری دیموکراتی: گوزارشت لە کراوەبوونی دەوڵەت بۆ کۆمەڵگا و تاکە دیموکراتەکان دەکات. ڕێکخستنبوونی دەولەت و ڕێکخستنبوونی دیموکراتیانەی تاك دیاردەی جیاوازن، ڕێزگرتن لە ڕەوابوونی یەکتری بەبنەما دەگرن.

چ ـ دەستووری دیموکراتی: ئەو دەستوورەیە کە بەهاودەنگیەکی کۆمەڵایەتیەوە پێکدێت، پاراستنی هاوڵاتی و جڤاتە دیموکراتیەکان لە بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە بە بنەما دەگرێت.

د ـ لەیەك جیا نەبوونەوەی مافی تاك و هاوبەش"كۆلەكتیف": وەك چۆن ئەو كۆمەڵگایەی لە تاكەكان پێكهاتووە دیسانیش لە كۆی تاكەكان جیاوازتریێت، هەرچەندە جیاوازیەكیش لەنێوانیاندا هەبێت، مافەكانی تاك و كۆلەكتیفیش گوزارشتی دووڕووی هەمان كۆمەڵگایە. وەك چۆن مەدالیایەكی یەك روو جێگای باس نابێت، ئەوا كۆمەڵگا یاخود تاكێكیش جێگای باس نابێت بەتەنیا خاوەنی مافی تاك یان كۆلەكتیف بێت.

ف ـ سەربەخۆیی ئایدیۆلۆژی و ئازادی: تا هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی پۆزیتیڤیستی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و كۆیلایەتی لیبراڵی دەرباز نەكات كە بەشێوەی تاكڕەوێتی سەرلەنوێ ئاواكراوەتەوە، ئەوا رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتی جێبەجێ ناكرێت. هۆشیاری خۆیی سەبارەت بەسروشتی كۆمەڵگاكەی خۆی، مەرجی هۆشیاری و تێگەیشتنی رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتییە.
گ ـ مێژوویبوون و هەنووكەییبوون: راستییە كۆمەڵایەتیەكان، راستی مێژووین. ئەو راستیانەی كە لەمێژوودا روویانداوە بەجیاوازیەكی زۆركەمەوە، ئێستا لە دۆخی هەنووكەدا روودەدەن. تا پەیوەندی نێوان مێژوو و ئێستا بەشێوەیەكی راست دەستنیشان نەكرێت، ئەوا زهنیەتی ساتەوەختی، هۆمۆژەن و هەنووكوگەرای كۆمەڵگاو تاكڕەوێتییە بێ مێژووكارەكەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز ناكرێت. راست تێگەیشتن لە مێژوو و ئێستا، مەرجێكی پێویستی رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتییە.

ە ـ ئەخلاق و ویژدان: تا پەنا نەبرێتە بەر ئەخلاق و ویژدان هیچ كێشەیەكی كۆمەڵایەتی بەچارەسەریەكی تەندروستانە ناگات. تەنیا رێگەچارەی هێزو یاسای تایبەت بە مۆدێرنیتە جگە لە سەركوتكردن و چەواشەكردنی كێشەكان بەولاتر هیچ ئەنجامێكی دیكەی نابێت. لە رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتیدا، هاوسۆزی ئەخلاقی و ویژدانی مەرجە.

و ـ بەرگری خۆیی دیموكراسیەكان: وەك چۆن هیچ زیندەوەرێك بێ بەرگری خۆیی نابێت، كۆمەڵگا دیموكراتیەكانیش كە پێگەیشتوترین هەبوونەكانی سروشتن بەبێ بەرگری خۆیی ناتوانن درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. لە رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتیدا پێویستە پێداویستیەكانی پرەنسیپی بەرگری خۆیی جێبەجێ بكرێت.
ئەو هەڵوێستە بەپرەنسیپانەی كە پێویستە زیاتر پێشبخرێن، لە نزیكەوە رێگەچارەی نەتەوەی دیموكراتیمان پێدەناسێنێت. ئەو پرەنسیپانە كە"یەكێتی ئەوروپا"ش وەك پەرەسەندنێكی تەدریجی بەردەوام دەیخاتە رۆژەڤی خۆیەوە، بەگشتی بۆ كێشەكانی كۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین، زیاتریش بۆ كێشەكانی كۆمەڵگای كورد، بەراستی وەك دەرمان وایە. ئەو رێگەچارە دیموكراتییەی لەسەر بنەمای ئەو پرنسیپانەو لەچوارچێوەی پێناسەكردنی ژیانی نەتەوەی دیموكراتی لە كوردستان پێشدەخرێت، گرنگیەكی مێژوویی هەیە.
دەستپێكردنی پرۆسەی دیموكراتیزەبوونی توركیا و رێگەچارەی دیموكراتیانەی كێشەی كورد، وەك دوو رووی مەدالیایەكن. رووێك بەبێ رووەكەی تر نابێت. ئەگەر رەهەندەكانی چارەسەری لە توركیا تۆزێكی تر بەرجەستە بكەین، ئەوا رۆشنكەرەوەتر دەبێت. پێش هەموو شتێك ئەو هەڵوێستە پرەنسیپییە پشتگوێ ناخرێت كە لە سەرەوە ئاماژەمان پێكردو دووبارەكراوەتەوە. ئەو رێگەچارانەی كە پرەنسیپ و سیستەمی خۆیان نییە، هەم دەركیان پێناكرێت، هەمانكاتیش وەك تیماركردنی رۆژانەی برینێك بەولاتر هیچ ئەنجامێكیتر نادات. ئەو رێگەچارەیەی كە بیری لێدەكرێتەوە، ئەگەر سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری هەڵوەشێتەوە، یاخود بەردەوام بێت، ئەگەری چارەسەریەكە بە درێژایی ئەو هەموو قۆناخە بونیادیەدا داكۆكی لەجێبەجێكردن و بەرێوەچوونی دەكرێت.
تایبەتمەندی یەكەم، واتە بە درێژایی قۆناخی شارستانیەتی رۆژئاوا رێگاچارەیەك پێشنیار دەكرێت كە بۆ دەربازكردنی ئەویش كراوەیە.
تایبەتمەندی دووەم، بونیاد، دەزگابوون و پاوانە ئایدیۆلۆژیەكاتی پشت فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ناو كۆماری توركیا هەرچیەك بن، هەبوونی كۆمەڵگای نەتەوەی دیموكراتی، لەو سۆنگەیەوە هەبوونی چانسی چارەسەری و رەوابوونەكەی پەسەند دەكات. لێرەدا فاكتەرەكانی رێگەچارەی دیموكراتی كە بیری لێدەكرێتەوە، نە لەناوبردنی فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری" دەوڵەت ـ نەتەوە، سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی" لە رێگای شۆڕشەوە پێشنیار دەكات، نە ئاسیمیلەكردن و لەناوبردنی ئەو فاكتەرانە لەلایەن سیاسەتەكانی هێزی سەربازیەوە پەسەند دەكات، بەڵكو بەیەكەوە ژیانی ئاشتیانەی ئەو دوو هەبوونە بە بنەما دەگرێت كە دان بە رەوابوونی یەكتردا دەنێن و پێشبڕكێیەكی ئاشتیانە دەكەن.
تایبەتمەندی سێیەم، پەیوەست بەهەر دوو خاڵی سەرەتاوە، پێشنیاری دەستلێبەرنەدراوی دامودەزگای سیاسەتی دیموكراتی دەكات. زەمینەی چارەسەری بۆ هەموو ئەو كێشانەی دەردەكەون و ئەوانەش كە هەنە، سیاسەتی دیموكراتییە. دانوستاندنی دیموكراتی و دیبلۆماسیەتیش لەناو سیاسەتی دیموكراتیدان. بۆ ئەوەی سیاسەتی دیموكراتی بەرێوەبچێت، پێویستە هیچ كۆسپ و تەگەرەیەك نەهێلدرێت. هەبوونی ئازادی بیروڕای

بەرفراوان، پارتی، کۆپەراتیف"هەرەوەزیەکان" و سەندیکای خاوەن بونیادی دیموکراتییانە و هەموو جۆرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، تەنیا بە نەهێشتنی ئەو کۆسپ و تەگەرانە فەراهەم دەبێت. لە هەڵبژاردنەکاندا یان تەواو هێنانە خوارەوەی یاخود بەتەواوی نەهێشتنی سیستەمی رژێمی، پێویستیەکی دەستلێبەنەدراوی سیاسەتی دیموکراتییە.
خاڵی چوارەم، پێویستە سیستەمگەلێك ئاوابکرێت کە پێویستی مافی بەرگری خۆیی هەردوو ئەنتیتە و هەبوونە سەرەکیەکە دابین بکات. لە راستیدا ئەو هەموو رەگەزانەمان لە بەشی" هەندێك زاراوە، تیۆری و پرەنسیپەکان" ی راپۆرتی ـ نەخشەی رێگادا، بەشێوەیەکی بەرفراوانتر هەوڵی پێناسەکردنی ئەو خاڵانەمان داوە. لێرە تەنیا بەشێوەی مۆدێل پێشکەش دەکرێت کە چۆن دەتوانین پراکتیزەی بکەین.

4ـ بەرجەستەکردنی رێگەچارەی دیموکراتیانە لەئاستی ناودا، (KCK)

دەشێت رێگەچارەی دیموکراتییانە لەئاستی ناویشدا یەکلایی بکرێتەوە. دامودەزگا و سنوورەکانی ئێستای کۆماری تورکیا بەرەوا دادەنرێت. کێشەکانی لە جۆری شێوەکانی ناوەندی"یونیتەر"، فیدراڵی و کۆنفیدرالی گفتوگۆی لەبارەوە ناکرێت، تەنانەت پێشنیاری بە رۆژەڤکردنیشی ناکرێت. ناوەڕۆکی دیموکراتی، ئازادی و یەکسانی هاوڵاتیانی کۆماری تورکیا، تەنیا لە دەستوور و یاساکاندا پێشنیار ناکرێت، بەڵکو پێشنیاری پراکتیزەکردنی دەکرێت وەك دامەزراوێك. لەو پێناوەشدا لەیەکتری جیانەکردنەوەی ماف و ئازادیەکانی تاك و ماف و ئازادی جڤات و ناسنامە کلتووریە کراوەکان دەستنیشان دەکات. پێشنیار دەکرێت فاکتەرەکانی سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشەی کورد، وەك بەشێکی دەستلێبەرنەدراوی دیموکراتیزەبوون، بەو دۆخەی ئێستای وەك بناخەکەی هەڵسەنگێندرێت. چارەسەریەکە لە تەوەرەی دەوڵەتدا نییە، سیستەمی دیموکراتی بە بنەما دەگرێت کە تەواوی کۆمەڵگا لەخۆوە دەگرێت. لەبەر ئەوەی فاکتەرە سەرەکیەکانی پێویستە لە سیستەمی دیموکراتی دەرکی پێبکرێت، لەبەشی"زاراوە، تیۆرو پرەنسیپەکان" و بەشەکانی دواتریش بەبەرفراوانی شیکارکراوە، پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات. بەڵام وەك زیاد کردنێك، دەشێت لە ئاستی ناودا KCK کۆما جڤاکێن کوردستان بۆ بەرجەستەکردن دەستنیشان بکرێت. بەردەوام جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکرێتەوە کە KCK وەك شێوازێکی"کۆماری تورکیا" یاخود ئەلتەرناتیفەکەی بیری لێنەکرێتەوە. لەلایەنی ناوەڕۆك و شێوەشدا، هەردووکیان پێکهاتەی لێکجیاوازن. کۆماری تورکیا بە پرەنسیپ و دامودەزگاکانی، بە مێژوو و ئێستایەوە هەوڵی شیکارکردنی دراوە. پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات KCK .ش هەم لەئاستی پێناسکردن و هەم لە ئاستی پەرەسەندندا پێویستی بە تاوتوێکردن هەیە. دەشێت بەوجۆرە پێناسە بکرێت کە رێکخستنی چەترە یان لە فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی کوردان پێکدێت.
دەستەواژەی هەستیار لێرەدا "هاوڵاتی دیموکرات" و "نەتەوە"ن. لەو بروایەدام کە گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر هاوڵاتی دیموکرات پێویست ناکات. پێناسەکردنی بەشێوەی ئەو تاکەی خاوەن ماف و ئازادی تاك و کۆلەکتیفە، باوەڕدەکەم ناڕازیبوونێکی ئەوتۆی لە بەرامبەر نابێت. لەوانەیە نەتەوەی دیموکراتی تۆزێك ئاڵۆزتر دیاربێت. بەڵام پێویستە لەبیرنەکرێت کە ئەو پێناسەیەی یەکێتی ئەوروپا لە شەڕی خوێناوی نەتەوەیی پێنج سەد ساڵی دوایی سەبارەت بە نەتەوە دەریخستووە نزیك ئەمەیە. تەنانەت نەتەوەپەرستیەتی دەوڵەتی بەهۆی ئەو چەقبەستبوون و کێشانەی لەگەڵ خۆی هێناوێتی لەرۆژی ئەمڕۆماندا بەخێرایی نەرم دەبن و دەرباز دەکرێن. لە دەستەواژە پێشخراوەکانی نەتەوە نوێکاندا بەردەوام جەخت لەسەر تایبەتمەندی دیموکراتی دەکرێتەوە. پێویستە پێناسەکەی مستەفا کەمال سەبارەت بە کۆماری تورکیا کە دەڵێت" بە گەلی تورکیا دەگووترێت میللەتی تورك" نەك لەلایەنێکەوە بەڵکو لەدوو لایەنەوە هەڵسەنگێنرێت، ئەوکاتە چارەسەرئامێزتر دەبێت. بەتایبەتیش ئەو داوەریە شۆفینییە زێدەڕۆ دەسەڵاتگەرێتییە پیاوسالاریانەی لە دەستەواژەی نەتەوەی تورك بارکراوە بەکارهێنانەکەی ئاستەم دەکات. بۆ دەستەواژەیەك گۆڕاوە کە تا دەچێت بەشدارکردنی ناسنامەکانی تر بەربەست دەکات. لەبەرئەوەش دەستەواژەی "گەلی تورکیا" زۆر نزیکی پێناسەی ئەو نەتەوەیە کە لە ناسنامەی کراوەو هاوڵاتیانی ئازاد و یەکسان و دیموکرات پێکدێت و من پێشنیارم کردووە، بگرە گوزارشت لەو دەکات. چونکە لەو کاتەشدا ئەو دەستەواژەیە گوزارشتی لە فرە ئەتنیکی دەکرد. بەرگریکردنێکی دەمارگیرانە لە دەستەواژەیەك کە بووە بە کۆسپ، خزمەت بە چارەسەری ناکات.
لە راستیدا دەشێت KCK بۆ کوردان وەك دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگای مەدەنیش پێناسە بکرێت KCK .وەك رێکخستنێکی چەترئاسای کۆمەڵگای مەدەنی، لە راستیدا دەشێت بەگوێرەی ناوەڕۆکەکەی لەناو هەمەگیری "گەلی تورکیا" یاخود "نەتەوەی تورکیا" جێگیر بکرێت. بەڕاستی ئەگەر لەناخەوە باوەڕی بە پێویستی جێگرتنی کوردان لەناو گەلی تورکیا یاخود نەتەوەی تورکیا بکرێت یانیش پەسەند بکرێت، ئاشکرایە کە پێناسەی هەرە گونجاوو نەرم پێویستە لەو لایەنەوە بێت. تەنیا لەمیانەی ئەو پێناسە نەرمەی نەتەوەوە، دەکرێ رێگا لەپێش توانستی کێشە خستنەوەی رێگەچارەی فیدراڵی و هەڵوێستی قڕکردن و نکوڵیکردن بگیردرێت. دیسان ئەوەی بۆ ماوەیەکی درێژ رێگا لە جوداخوازی و توندوتیژی دەگرێت، ئەو نەتەوە نەرم و رێکخستنە چەتر ئاسایەکەیەتی. لە مێژوو ژیانی رۆژانەوە زۆرباش ئاگادارین کە رێگەچارەی هێزی سەربازی و فیدراڵی، نەك

تەنیا توانستی چارەسەرکردنی کێشەکانیان نییە، بەڵکو بەردەوام خۆیان دەرگا بە ڕووی دۆخی شەڕو جوداخوازی بەکراوەیی دەهێڵنەوە. کورد لەو ڕەوشەی ئێستا تێیدان جڤاتبوونی خۆیانیان بەرەو پێشەوە بردووە، وەك تاکیش لە ئازادبووندا لە پێگەیەکی پێشکەوتوودان. داسەپاندنی شتێکی لەمە کەمتر بە سەریاندا، ئەوا ڕێگا لەبەردەم توندوتیژیەکی فراوانترو جوداخوازی دەکاتەوە، لە ڕاستیدا لەو ڕێگایە کراوەیەدا هەنگاو بۆ ڕێپێوانێکی خێراو بەهێزتر دەهاوێژن، هەڵبەتە قسەکردن لەو بارەیەوە پێویستی بە کەهانەت نییە. بەڕێوەبەرایەتی فیدرالیزمی کوردستان لە باکوری ئێراق تارادەیەك گوزارشت لەو ڕاستییە دەکات. هەروەها ئەنجامی سیاسەتەکانی نکوڵیکردن و لەناوبردنی مێژووی کۆماریش لەبەر چاوانن. ئەگەر ئەو قۆناخە لەبەرچاوان بگیردرێت کە زانستی کۆمەڵناسی پێیگەیشتووەو لەو چوارچێوەیەدا ڕێگەچارەی KCK تاوتوێ بکرێت، ئەوا ڕوون دەبێتەوە کە ڕێگەچارەیەکی هەرە گونجاوە بۆ ڕاستی تورکیای دیموکراتی، کۆماری دیموکراتی و نەتەوەی دیموکراتیی، لەهەمانکاتدا بەهێزترین ئەگەریشە.
لە حاڵەتی بەکرداریکردنی ڕێگەچارەی KCK پێشبینیکردنی پێشهاتەکان فێرکەرو ئەزمونبەخش دەبن. لەو دۆخەدا دامودەزگاکانی کۆمار بوونی خۆیان دەپارێزن و بەردەوام دەبن. بەڵام ئیتر ڕەوشێکی جیاوازتر هاتۆتە ئاراوە. بەدامەزراوەبوونی KCK ش بەرەو پێشەوە دەچێت. لەکاتێکدا دەوڵەت بەشێوەی یەکینەی ئیداری خۆی پراکتیزە دەکات، KCKش خۆی بەشێوەی دامودەزگای دیموکراتی کارادەکات. لەوانەیە بابەت و پێگەکەیان جیاواز یان لێکبچێت. کاتێك جیاوازی جێی باس بێت، لایەنە یەکتری تەواوکەرەکان گرانتر دەبێت. کاتێك لێکچوونیش لە ئارادابێت ئەوا پێشبڕکێی ئەرێنی دەستپێدەکات. کامەیان وەڵامێکی باشتر بۆ کێشە کۆمەڵایەتیەکان بدۆزنەوە، پشتیوانیکردنی دەردەکەوێتە پێش.
گرنگترین لایەنی ئەو مۆدێلەی چارەسەری لەوەدایە کە پێویست بە ڕەدکردنەوە یان بە ئەویترکردنی یەکتری ناکات. سەرجەم ڕێگەچارە باوەکان، واتە ئەوانەی دەوڵەتین و لە تەوەرەی مافی تاکن، لەسەر بنەمای ڕەدکردن یاخود ئەویترکردن ئاواکراون. تا یەکێکیان نەرووخێت یان نەکرێت بە ئەویتر، ئەوەی بەرامبەر یان ئەوەی بە باشتر دادەنرێت لە شوێنی جێگیر ناکرێت.
لێرەدا ڕۆڵی دۆگماتیزمی ئایینی و پۆزیتیڤیست دیاریکەرە، لە مێژوو و ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا جگە لەوەی کۆمەڵگایان کردۆتە تۆپەڵێکی کێشە بەولاوە هیچ ئەنجامێکی تریان نەبووە. پێدراوە نوێیەکانی زانستی کۆمەڵناسی جەخت لەسەر نەرمایی سروشتی کۆمەڵگاو ئاستی بەرزی زهنیەتەکەی دەکاتەوە. ئاماژە بە بەربڵاوی پەیوەندی سیمبیۆتیك دەکات. هەروەها ناچاری نەبوونی ناکۆکی ئانتاگۆنیست"پێکهەڵپژان" کان دەخاتە ڕوو. لەجیاتی ئەوەی پەیوەندی دەزگاکانی سیاسەتی دیموکراتی "پێویستە KCK وەك ڕێکخستنی چەتری ئەو دەزگایانە دەرکی پێبکرێت" لەگەڵا دەوڵەت ڕووخێنەر بێت، ئەوا پێویستە باس لە دۆخێك بکرێت کە دەوڵەت بەرەو پێگەی لەبارو کارا ببات. هەرچەندە قۆناخی گرژیش جێگای باس بێت، بەڵام ئەو دیالۆگە بەهێزەی نێوانیان دەتوانێت چارەسەری دیموکراتییانە بئافرێنێت. دەشێت بڵێین ئەگەر قۆناخەکە بەرەو پێشەوە بچێت، ئەو شێوە دەزگایانەی کە لەسەر پێیان بمێنن، ئەوانەی کە پێویستن و سوودبەخشن، پێگەی خۆیان دەپارێزن، پەرەدەسەنن و بەردەوام دەبن، هەرچی ئەوانەن کە پێویست نین و هیچ سوودێکیان نییە، ئەوا دەرباز دەکرێن. هەڵبەتە ئەمە ئەو ئەنجامەیە کە لە میکانیزمە دیموکراتییەکان چاوەڕێ دەکرێت.

## 5ـ ڕەهەندەکانی ئەگەری پراکتیزەکردنی ڕێگەچارەیKCK

کاتێك ڕەهەندەکانی ئەگەری پراکتیزەکردنی ڕێگەچارەی KCK بخەینە ڕوو، ئەوا بابەتەکان ڕوونتر دەبنەوە:

ا ـ ڕەهەندی ئابووری: خەباتێکی بەرفراوانی KCK لەسەر گۆڕەپانی ئابووری دەبێت. لە بەرامبەر کاریگەرییە وێرانکارەکانی قازانجپەرستی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر ژینگە، ئەوا کۆمەڵگا و ژینگە دەپارێزێت. ئەوەش لەمیانەی ئەو یەکینانەوە بەڕێوە دەبات کە قازانج بەبنەما ناگرێت، وەڵامی پێداویستییە سەرەکیەکانی کۆمەڵگا دەدەنەوە و ژینگە پارێزن، لە سەرووی هەمووشیانەوە کۆمینە ئابووری و ئیکۆلۆژیەکان. ڕێگا لە تاڵانی قۆرخکاری سەر بازاڕی کۆمەڵگا دەگرێت. فاکتەرەکانی سەرمایەداری لەناو نابرێن، بەڵام زۆر سنووردناردەکرێن. کارکردن لە دۆخی سوغرەو کۆیلایەتی ڕزگار دەکرێت، دەکرێت بە دۆخێکی عیبادەتی ژیان. دیوارە هەڵبەستراوەکانی نامۆبوون لە نێوان کارو ژیاندا دەڕووخێنرێن. لەجیاتی ئەو سیستەمەی هەرشتێکی کۆمەڵگای کردۆتە کاڵاو لەناو کاڵادا دەیخنکێنێت، لەپێشینەیی بەو سیستەمە ئابوورییە دەدات کە پشت بە بەهاکانی بەکارهێنان و ئالوگۆڕی ناچاری دەبەستێت. ئەو زەمینە ژینگەپارێزی و کۆمەڵایەتییەی کە KCK پشتی پێدەبەستێت، وەك ڕۆبێکە بۆ ئەو سیستەمە ڕابێت. ئەوەندەی نەهێشتنی بێکاری بەربڵاو، چەمکێکی ئەخلاقی کە کارکردن وەك ئازادی هەڵدەسەنگێنێت، سەرجەم حەسرەتە ڕاستەقینەو پێداویستیەکانی کۆمەڵگا جێبەجێ دەکات کە پێویستی دەبینێت.

ب ـ ڕەهەندی کۆمەڵایەتی: سیستەمی KCKلە وەڵامدانەوەی پێویستیەکانی کۆمەڵگا لە بوارەکانی وەك پەروەردە، تەندروستی، وەرزش، هونەر و حقوقیدا، شێوازێکی گونجاوی بەرهەمهێنانە. لەو بوارانەدا کە پێشبرکێ و پەیوەندی بەرامبەر"پەیوەندی سیمبیۆتیك" لەگەڵا دەوڵەت لەئارادا دەبێت، کاتێك ئەو خاڵەش لەبەرچاوان بگیرێت کە دەزگاکانی کۆمار تائێستا وەڵامی چاوەڕوانیەکانیان نەداوەتەوە، ئەوا باشتر دەرك بە پێگەی کاریگەری KCKدەکرێت. بەپێچەوانەی مەزەندەکانەوە، لەو گۆڕەپانانەدا زمان و ئەتنیك هێندە نابن بە کێشە. فرە زمانی پەروەردە وەك پێداویستیەکی کۆمەڵایەتی، ڕەوشێکە پێویستە هانبدرێت و پشتگیری لێ بکرێت. هێندەی زمانی تورکی بەرەوپێشبردنی زمانی کوردی یاخود زمانەکانی ترو بەکارهێنانیان لە پەروەردەدا، بەراستیش مانای دەوڵەمەندی واتایە. لەم گۆڕەپانەدا پێویستی و شوێنی شۆڤینزم و خۆداسەپاندن نییە. بەرەوپێشبردنی دەزگاکانی پەروەردە، تەندروستی، وەرزش و هونەری کوردی لە چوارچێوەی نەتەوەی دیموکراتیدا دەبێت، لە ناوەڕۆکدا یەکێتی نەتەوەیی پێکدێنێت و دەوڵەمەندی دەکات. دەشێت هەمان خاڵ سەبارەت بە کلتوورەکانی تریش ئاماژەی پێبکرێت. ئەگەر گەلی تورکیا یاخود نەتەوەکەی وەك یەکێتی دەوڵەمەندییە کلتوورییەکان شرۆڤە بکەین، ئەوکاتە دەبینرێت کە زۆرێك لەو خاڵانەی بەمەترسی دادەنرێن و وەك"هێڵی سوور" دەبینرێن، لە پێشینە داوەرییەکی دۆگماتیك و موحافەزەکار زیاتر خزمەت بە پێشکەوتن ناکەن. هەڵوێستێکی تر نییە کە هێندەی یەکێتی نەتەوەیی ئارەزوومەندانە هێزبەخش بێت.

ج ـ ڕەهەندی ئاسایشی: یەکێك لەو ڕەهەندانەی گفتوگۆیەکی زۆری لەسەر بکرێت و پێویستی بە بڕیارو یاسا هەبێت، دەربارەی بواری ئاسایشی دەبێت. لەبەرئەوەی کوردان لە بێبەشبوون لە ئازادی بەولاتر، وەك بوون بەردەوام لە کەنارو لەناو مەترسیدا ژیاون، ئەوا داوای گەرەنتیەکی بەهێز دەکەن و پێداگری لەسەر ڕێگەچارەی دامەزراوەیی دەکەن. سوپای کۆمار لەبەرامبەر مەترسیەکانی دەرەوە بەرگری لێدەکرێت، بەڵام پێویستە سەبارەت بە هەبوون و ئازادی کوردان وەرچەرخانێکی ڕادیکاڵا لە هەڵوێستی خۆیدا بکات. هەمان خاڵ بۆ دەزگاکانی دیکەی ئاسایشیش لەجێگای خۆیدایە. تا ئەو گۆڕانکاریانە ئەنجامدەدرێن KCK ناچارە پارێزگاری لە هێزەکانی بەرگری خۆیی بکات. بەتایبەتی تا جاشایەتی، ژیتەم بەو دۆخەی ئێستای و گروپە پارەملیتارەکانی دیکە "هەندێك لەوانەی ئەرگەنەکۆنیش لەناودا" هەبن، ئەوا یەکینەکانی بەرگری خۆیی KCK فاکتەرێکی دەستلێبەرنەدراوی ژیانی دیموکراتین. پێویستە جێگیربوونی سوپا لەکوردستان بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشەکانی دەرەوەبێت، هەروەها کوردان وەك فاکتەرێکی ڕەسەنی یەکێتی نەتەوەیی و دەوڵەت پەسەند بکرێت، چیتر وەك سەرچاوەی هەڕەشە نەبینرێن. بۆ دەربازکردنی ئەو بیرەوەرییە تاڵانەی لەو لایەنەوە لەمێژووی کۆماردا ڕوویانداوە، پێویستە هەوڵ و کۆششێکی هاوبەشی بۆ بکەین. دەشێت ڕێگەچارەی جۆراوجۆر بۆ یەکینەکانی بەرگری خۆیی KCK بدۆزرێتەوە. دەشێت بیر لە پێگەی کاتی و بەردەوامیش بکرێتەوە. ئەگەر هاوشێوەی دۆخی کوردەکانی ئێراقیش نەبێت دەشێت لە چوارچێوەی سوپا و هێزە ئاسایشیەکانی تردا، ببێتە پارچەیەك لە ئاسایشی هەرێمەکە.

د ـ ڕەهەندی دیبلۆماسی: کێشەی هەرە گرنگ لەو ڕەهەندەدا، لەسەر بنەمای دژایەتی میساقی میللییەوە چۆن سەیری دابەشکردنی کوردان و کوردستان دەکرێت وچ جۆرە ڕێگەچارەیەك پێشنیار دەکرێت. هەڵبەتە تورکمان، تەنانەت ئەرمەنی و سوریانیەکانیش لەناو ئەو مەسەلەیەدان. دۆخەکەیان کاریگەری لەسەر سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەش دەکات. ڕووداوەکانی ئێراق و ئەرمەنستان تا دوارادە ڕۆشنکەرەوەن. ناشێت گرنگی ڕووداوەکانی سوریاش بچووك بکرێنەوە. خۆی لە خۆیدا ئێران هەموو جیهان پەیوەندیدار دەکات. پێویستە بە جۆرێك تەماشا نەکرێت کە زۆر دووری پەیمانی قەسری شیرین ماوەتەوە. نەبوونی کات فشارمان بۆ دێنێت. تەواوی ئەو بابەتانە لە ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناویندا بیرکردنەوەو دۆزینەوەی ڕێگەچارە دەکات بە ناچاری KCK . نموونەیەکی بەرکەمالی ئافراندنی ڕێگەچارەیە لە ئاستی ڕۆژهەڵاتی ناویندا. بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازی نەتەوەو ئەتنیك، راستتریش لە چوارچێوەی جیاوازی ئایینزایی، ئەتنیکی و نەتەوەییدا سیستەمێك پێشنیار دەکات کە کێشەکان چارەسەر دەکات.
ئەو مۆدێلەی لێرەدا بیری لێدەکرێتەوە، سیستەمێك نییە کە سنووری سیاسی نەهێڵێت، ڕێگا لە پێش چارەسەری سەربازی بکاتەوەو تەنیا بۆخۆی فیدرالیزم بسەپێنێت. باسی پێشخستنی شێوازێك دەکەین کە یەکێتی ئەوروپاشی لەناودا زۆرێك لە شێوازەکانی چارەسەری جیهان لەبەرچاوان دەگرێت، بەڵام خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی KCK .ئەم پێویستییە لەبەرچاو دەگرێت. لەچوارچێوەی یەکێتی نەتەوەی تورکیادا، دەشێت وەك ڕێکخستنێکی چەتر بەرفراوان بکرێت کە هەموو کوردانی ڕۆژهەڵاتی ناوین، ئەرمەنی، سوریانی و تورکمانەکانیش لەخۆوە بگرێت. مەرج نییە دەوڵەتەکان لەخۆوە بگرێت. دەکرێ دەوڵەتەکان لەناو خۆیاندا یەکێتیەکی هاوشێوەی یەکێتی ئەوروپا پێشبخەن. بەتایبەتیش کۆنفیدراسیۆنێکی خاو لە نێوان تورکیا، سوریا و ئێراق پێشنیار بکرێت. دەکرێ هەنگاو بە هەنگاو ئەو مۆدێلە لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا بەرفراوان بێت و قووڵتر ببێتەوە. مۆدێلی چارەسەری KCK وەك مۆدێلێکی دژی یەکێتی دەوڵەتان نییە، بەڵکو وەك یەکێتیەکی

کۆمەڵگای مەدەنی، کۆنفیدرالیزمێکی دیموکراتیانەی ئەو رێکخراوانە بیری لێدەکرێتەوە کە لە پێویستی کۆمەڵگاوە دروستبووە، هاوتەریبێتی و تەواوکاریانە. پراکتیکی رۆژهەڵاتی ناوین، پڕ لەو پەندو ئەزموونانەیە کە تەنیا بە چالاکی و کاروباری دیبلۆماسی دەوڵەتان ئەو کێشانە چارەسەرناکرێن. لەخۆڕا نییە کە یەکێتی ئەوروپا بەلانی کەم هێندەی لە یەك ئاستی یەکساندا پێشخستنی یەکێتی کۆنفیدراسیۆنی دەوڵەتان، کۆنفیدراسیۆنی کۆمەڵگای مەدەنیشی پەرەپێداوە. پێویستی کۆمەڵگاکانی بان نەتەوەی رۆژی ئەمڕۆمان، رێکخراوی هاوکاری بەو شێوەیەی کردووە بە ناچاری. لە دۆخی بەرجەستەی رۆژهەڵاتی ناویندا کۆنفیدرالیزمی دەوڵەتان و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتی کۆمەڵگای مەدەنی لە هەمان ئاستدا گرنگ و پێویستن، هەر بۆیەش پێویستە پێکەوەو بە شێوەیەك یەکتری تەواوبکەن پێشبخرێن، بەو شێوەیەش ئەمجۆرە کێشانە چارەسەر بکات.
سەبارەت بە KCK دەشێت باسی هەندێك رەهەندی تریش بکەین. بەڵام لەبارەی ئەو پێشهات و پراکتیکانەی کە بێنە ئاراوە، ئەو رەهەندانە، لەئاستێکی پێویستدا رۆشنکەرەوەن و پێشنیار پێشدەخات. بێگومان سەبارەت بە هەر رەهەندو بوارەکانی تر، کێشەگەلێکی دەستووری و یاسایی و زۆرێك لە کێشەکانی پەیرەوی ناوخۆ جێگای باسەو پێویستییان بە چارەسەرکردن هەیە. لەو لایەنەوە دیالۆگی بەرفراوان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشی دەوڵەتدا پێویستن، ئەوەش کۆمەك بە چارەسەری هاوبەش دەکات. ئەو خەباتانەی لە ئاستی حکومەت و پەرلەمانی تورکیادا بکرێن، رۆڵی کلیل لە چارەسەریدا دەبینێت. هەروەها تەنیا دیالۆگ و هەوڵی هاوبەش لە ئاستی دامودەزگاکانی دەوڵەتدا بەش ناکات. بەهەمانشێوە بەتەنیا هەوڵەکانی حکومەت و پەرلەمانی تورکیاش بەس نییە. بەڵکو رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و پارتە بەرهەڵستکارەکانیش کە بەشێکین رۆڵی گرنگیان دەبێت. بەتایبەتیش کارو خەباتی سەر رای گشتی مەرجە. لێرەدا دەزگاکانی راگەیاندن و میدیاکان رۆڵێکی ژیانی دەبینن. هەروەها رۆڵ و کۆمەکی زانکۆکان و دونیای ئەکادیمیش بچووك ناکرێتەوە. هەروەها دەشێت چاوەڕوانی کۆمەکی هێزە نێودەوڵەتیەکان لە سەروویانەوە ئەمریکا و ئەوروپا بۆ چارەسەری بکرێت، کە تەنانەت هەندێکیان لە پێگەی لایەندان و خاوەن ئەزموونن.
ئەو هەڵسەنگاندنەی کە سەبارەت بە کرانەوەی دیموکراتی لە تورکیا و مۆدێلی چارەسەری بۆ کێشەی کورد پێشکەشکراون، پێویستە وەك گەڵاڵەنامەی تێروانین و پێشنیار ببینرێت. بەو ئامانجەی هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکان بیروراو پێشنیارەکانی خۆیان پێشبخەن، وەك پێویستی بەرپرسیارێتی سەر شانی خۆم، ئەو گەڵاڵە پێشنیارەم پێشکەش کرد. ئەوەندەی گفتوگۆ و پێشنیارەکان پێشبکەون، هەڵبەتە ئەوا کۆمەکی جیاوازترمان جێگای باس دەبێت.
لەمە بەدواوەش پێویستی بە بەرنامەو پلانێکی چالاکی هەیە بۆ ئەوەی بزانین لەکوێ و چۆن دەستپێبکرێت، ئاخۆ لەپراکتیکدا چۆن و چی بکرێت. لەولایەنەوە پێشنیارپلانەکەم لە بەشی دواتردا پێشکەش دەکەم.

بەشی پێنجەم: پلانی چالاکی

هەر مۆدێلێکی چارەسەری کە سەبارەت بە کێشەکانی کۆمەڵگا پێشنیار دەکرێت، ئەگەر بەهایەکی پراکتیکی نەبێت، جگە لە جوملاستیکی هزری هیچیتر نییە. هەڵبەتە هەنگاوی پراکتیکیش پەیوەندی بە هزراندنەوە هەیە، هزراندنێکی بزۆکە. هەروەها بەهای شیکردنەوە سەرکەوتووەکان تەنیا لە پراکتیکدا دەسەلمێنرێت.
لەلای خۆمەوە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد، لەجیاتی هەنگاوانی کرداری یەکلایەنە، ئەگەر بەشێوەیەکی ناشارەزاییش بێت هەنگاوانی کرداریم لەلا گرنگترە. لەو بڕوایەدام کە پێویستە بەردەوام لەپێشینەیی بە دیالۆگی مانادار بدرێت. بەڵام ئەوەش دەزانم کە خۆ خەڵەتاندن بەناوی دیالۆگەوە ماڵوێرانی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پێویستە دۆخی دانوستاندنی لایەنەکان بچووك نەبینرێت. چونکە بچووکترین زەمینەی دانوستاندن، لەچالاکیەکی زۆر گەورە و سەرکەوتوو بەهادارترە.
لە ساڵانی"1970"دا لە قۆناخی لەدایك بوونی PKK دا، سیاسەتێکی زۆر توندی نکوڵیکردن سەبارەت بە کوردان بەڕێوە دەچوو. تەنانەت بە زارەکیش رووبەڕووبوونەوەی ئەو سیاسەتە سزای زۆر گرانی لێدەکەوتەوە. هەر لەو قۆناخەدا لەگەڵ گروپە چەپەکان لەپێشینەیی بە چارەسەری دیموکراتی هاوبەش دەدرا. هەڵبژاردنم بۆ سەرۆکایەتی) ADYOD کۆمەڵەی باڵای فێربوونی دیموکراتی لە ئەنقەرا ـ 1975) بەو ئامانجە بوو. کاتێك ئەو هەنگاوە بەڕێوەنەچوو، ئیتر هەنگاونان بەرەو دەرکەوتنی PKK دەستلێبەرنەدراوبوو. هەروەها پەنابردنە بەر قەڵەمبازی "15ی ئاب"یش دیسان تاکە ئەلتەرناتیف بوو لەبەرامبەر سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن. هەرچەندە وەك دەمویستیش نەبێت، بەهەموو هێزو تواناکەوە لەسەری وەستام و دوودڵیم نەکرد.
ئەگەر ئەو کەشەی لەلایەن بەڕێز سەرۆك کۆمار تورگووت ئۆزاڵەوە لە سەرەتای ساڵانی"1990"وە بۆ دیالۆگ پێشکەش کرابوو پەرەی پێدرابوایە، لەوانەیە ئەمڕۆ کێشەی کورد لە دۆخێکی زۆر جیاوازتردا بووایە. دەوڵەت دەرفەتی دیالۆگ و دانوستاندنی بە سەرۆکەکەی خۆی نەدا. پراکتیکی نکوڵیکردن و قڕکردنی باو بەهەموو هێزی خۆی دەستبەکاربوو. بەقۆناخی هەرە تاریکی مێژووی کۆماردا تێدەپەڕین. ئەو ئەزموونەی دیالۆگ کە لەساڵانی"1997 ـ 1998"دا بەرەی سەربازی و سیاسی لێی نزیکبوونەوە، تووشی هەمان چارەنووس هات. بەربەستە ناوخۆیی و دەرەکیەکان، بەکورتی گلادیۆی لەسەر هەموو بونیادە سیاسی و سەربازیەکان بە

کاریگەربوو، تەنانەت دەرفەتێکی هەرە بچووکیشیان بە دیالۆگ و دانوستاندن نەدا. سەرباری هەمموو هەوڵەکانم تا بتوانم قۆناخی لێکۆلینەوەکانی ئیمراڵی بکەم بە زەمینەی دیالۆگ و دانوستاندن، بەڵام هەندێك لایەن بەردەوام ئەو هەوڵەیان تێکدا. سەرجەم پێشنیارەکانم بێ وەڵام مانەوە. ئاشکرایە کە تا لەناوبردنی دوایی بزووتنەوەکەمان پیلانڕێژی کرابوو، تەنانەت بونیادگەلێك جێگای باسبوون کە دیالۆگ و دانوستاندنیان وەك کۆتایی خۆیان دەبینی. ئەوانە بە شێوەیەکی زۆر سەرنجراکێش درەوشابوونەوە، لەناو دەوڵەتدا ببوون بە دەوڵەت. ئەوانە مەترسیدارترین و بێڕەحمترینی بەشی ئەو توێژانە بوون کە دووچاری نەخۆشی دەسەڵاتدارێتی هاتبوون. سەرەڕای تەواوی ئاگادارکردنەوەکانم، بەڵام دیسان هەزاران گیان لەدەستدان و زیانی مادی بێ ژمار هاتە ئاراوە. من خۆم لە ساڵانی"1990" بەدواوە هەوڵمدەدا شەڕ سنووردار بکەم. بەڵام کاتێك ئەمە ئەنجامی نەگرت، سەرەڕای ئەوەی نەخوازراویش بوو، ناچاربووم کە ئەو ئاگادارییە دواییە بکەم کە لە چوارچێوەی کوردو کوردستاندا قۆناخی بەرخودانی هەمەلایەنە بە مەبەستی" پاراستنی هەبوون و دەستەبەرکردنی ئازادیەکانیان" دەستلێبەرنەدراوەو بەرێوەدەچێت. بەهۆی ئەگەرە بەهێزەکانی ئەو پێشهاتانەوە ئاماژە بە زەمینەی دیالۆگ و دانوستاندن کرا.
ناشێت پلان لەنێوان لایەنەکانی شەڕدا نەبوویێت. پلانی چالاکی، ئەو کارەیە کە زۆرترین راوەستەی لەسەر کراوەو هەوڵی بۆ دراوە. لە ئەزموونەکانی خۆمەوە ئاگادارم کە ئەمجۆرە کارانە هەن. بە شەوقەوە پلانی چالاکی یەکلایەن دادەڕێژرێت. ئەوەی زەحمەتە، داڕشتنی ئەو پلانانەی چالاکییە کە لایەنەکان دەگەیەنێتە یەکترەوە. هاوسۆزی "ئەمپاتی" بەرامبەر یەکتر نەبێت، پلانی بەو شێوەیە پێشناکەون. شانبەشانی هەڵسەنگاندنێکی کورت سەبارەت بە پلانی چالاکی کە یەکلایەنە بەرەو پێشەوە دەچن و هێشتاش پێك دەهێندرێن، هەوڵی سەبارەت بە پلانی چالاکی دەدەم کە رێگا لەپێش رێکەوتنی هەردوو لایەن بکاتەوە. پێویستە لەسەرەتاوە ئاماژە بەو خاڵە بکەم کە من خۆم وەك لایەنێکی بەرپرسیاری جێبەجێکردنی پلانەکە نابینم. چونکە دۆخی بەندکراویم و هەلومەرجەکانی جێبەجێکردنی دەرفەتم نادات. ئەو تێڕوانینانەی پێشکەشی دەکەم ئامانجی ئەوەیە لایەنەکان بەشێوەیەکی راستتر یەکتری بناسن و ئەگەرە کردەو نەکردەکانی سەبارەت بە پلانی چالاکی هاوبەش روون بکرێتەوە .
بۆ ئەمەش:

1ـ پلانی رێگەچارەی نکوڵی و قڕکردنی باو: هەرچەندە وەك رابردوو بە شێوەیەکی خەستیش نەبێت بەڵام هێشتا لە چوارچێوەی ئەو چارەسەریدا پلان پێشدەخرێن و جێبەجێدەکرێن. ئەو توێژانەی بناخە چینایەتیەکەیان پشت بە قازانجپەرستی دەوڵەت دەبەستێت و بریتین لە بۆرژوازی چینی ناوین و بیروکراسیەکەی، سەرەڕای ئەوەی لە ناوەوەو دەرەوە زۆر گۆشەگیر و ریسواشکراون، بەڵام لە جێبەجێکردنی پیلانی لەناوبردن بە شێوازی تەڵەکەبازی و قەبە دوودڵی ناکەن. جگە لە توێژی بەکرێگیراوی کلاسیکی کورد، تەواوی کوردان، بە بەرفروانترین بەرخودانی مێژوویی وەڵامی پەیرەوکردنی ئەو پیلانە دەدەنەوە PKK .کە لەپێگەی پێشەنگایەتی بەرخودانەکەدایە، تا ئەو پیلانانە بەردەوام بێت، خاوەنی ئەو هێزو توانستەیە کە لەمە بەدواوەش پلانی چالاکیەکانی خۆی بە شێوەیەکی بەرفراوان جێبەجێ بکات. لە دۆخێکی ئەوتۆدایە کە دەتوانێت لە پلانی بەرگری پاسیڤەوە بەرەو بەرگری ئاکتیف و پلانی بەرخودانی سەرتاسەری هەنگاو بهاوێژێت. لە ماوەی داهاتوودا لە بەرامبەر چەقبەستبوونی جدی کە لە چارەسەری دیموکراتیدا روودەدەن، لەوانەیە دەرباز ی پلانی بەرگری سەرتاسەری ببن.

2ـ پلانی رێگەچارەی فیدراڵی میللیگەرا: ئەو پلانەش لە ئاست و گۆڕەپانی جیاوازدا جێبەجێدەکرێت. دەوڵەت ـ نەتەوە باوەکانی ناوچەکە و هێزە هەژموونگەرا جیهانیەکان لە پشت ئەو پلانانەوەن کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کوردستانی ئێراقەوە جێبەجێ دەکرێت. هەرچەندە مەبەستی هەموویان لە یەکتری جیاوازیش بێت، بەڵام ریکەوتنێکی گشتی جێگای باسە. بەمەبەستی چەواشەکردنی پۆتانسێلی شۆڕشگێری دیموکراتییانەی کوردان، پشتیوانی ئەو پیلانە دەکەن. ئەمریکا ئەو هێزە هەژموونگەرایەیە کە بەشێوەیەکی ئاشکرا پشتیوانی لە فیدراڵی کوردان دەکات. لەکۆنترۆڵ کردنی ئێراق، سوریا، ئێران و تورکیادا دەسەڵاتی فیدراڵ رۆڵێکی ستراتیژی دەبینێت. دەسەڵاتدارانی تورکیا، ئێران و سوریا لە پێناو شکاندنی بەرخودانی کوردەکانی ژێر دەستی خۆیان و بە نەبوو دانانیان، بەشێوازی جیاواز پشتیوانی دەدەنە پلانی "کوردستانی بچووك" کەوا لە شەڕی جیهانی دووەم بەدواوە لە باکوری ئێراقدا تەنگ کراوەتەوە. کاتێك کوردان بیانەوێت ئەو رۆڵە دەرباز بکەن کە بۆیان دانراوە ئەوا ئەو هێزانە هەموویان پێکەوە رووبەڕووی دەبنەوە.
سیاسەت و پیلانگێری پەرتکە ـ زاڵبە، زیاتر لەمیانەی پرۆژەی "کوردستانی بچووك"ەوە بەڕێوەدەبرێت. بەتایبەتیش لەو رێگایەوە هەوڵدەدرێت شۆڕشگێر، دیموکراتە رادیکاڵ و سۆسیالیستەکان بێکاریگەر بکرێن. یەکێکیش لە ئامانجی سەرەکی پیلانەکە گۆشەگیرکردنی PKK یە. خەباتێکی زۆر بەرفراوانی گلادیۆ سەبارەت بە گۆشەگیرکردن و لەناوبردنی PKK هەیە. هەروەها ئەو پیلانە لە گۆڕەپانی دیبلۆماسی نێودەوڵەتیشدا پشتگیریەکی بەرفراوانی هەیە. ئەمریکا ـ تورکیا ـ بەڕێوەبەرایەتی ئێراق کە بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵیشیان

هێناوەتە ڕیزی خۆیان، لە چوارچێوەی ئەو پیلانەدا هەوڵدەدەن PKK ناچاری دەستبەردان لە خەباتی چەکداری بکەن. بەڵام لەبەر بەرژەوەندی جیاوازی لایەنەکان ئەو پیلانە لەئاستی پێویستدا بەڕێوەناچێت، جێبەجێکردنەکەی سنووردارە. لەبەر ئەوەی لەلایەن زۆربەی زۆری کۆمەڵگای کوردییەوە پشتگیری لێناکرێت، هیوایەکی ئەوتۆیان پێ نییە. لەبەر ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندی توێژێکی هەڵبژاردە دەکات، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر ئاشکرا دەبێت و ڕووبەڕووی گۆشەگیری دەبێتەوە.
وەڵامی PKK ش بەرامبەر بەو پیلانە بەشێوەی "ڕادەستنەبوون و بەردەوامکردنی بەرخودان" بووە. خاوەنەکانی ئەو پیلانە سەرەڕای ئەوەی ویستویانە بزووتنەوەیەکی بەکرێگیراو لەو کەسانە پێکبێنن کە ماوەیەکی زۆر لەناو ریزەکانی PKK شوێنیان گرتبوو، بەڵام بێ بڕیاربوون و لەناو لاوازی ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژیدا دەژیان و ڕایانکردووەو چوونەتە لایان، بەڵام لە ئاشکرابوون ڕزگاریان نەبوو. لەبەرئەوەی میللیگەرایی کوردیش بەهۆی لاوازی نەریتیەوە نەیتوانیوە پیلانی دەوڵەت ـ نەتەوە بە شێوەیەکی بە بڕیار بەرەو پێشەوە ببات، ڕزین و لەناوچوون بۆتە چارەنووسیان. ئەو توێژانە تەواوی هیواکانی خۆیان بە تێکشکانی بەرخودانی PKK بەستۆتەوە. حکومەتەکانی تورکیاش ماوەیەکی درێژ هیواکانی خۆیان لەو لایەنەوە بەکارهێناوە. چاوەڕوانی یارمەتییان لە میللیگەرایی کورد کردووە کە پشت بە"کوردستانی بچووك" دەبەستن. ئەو پیلانەی لەسەر ئەرمەنی و ڕۆمەکانیان جێبەجێکرد، خوازیارن لەسەر بنەمای "کوردستانی بچووك" هاوشێوەیەکیشی لەسەر کوردان جێبەجێبکەن. بەڵام جیاوازی هەلومەرجەکان و پێگەی PKK بوونەتە هۆکاری پێچەوانە بوونەوەی ئەو پیلانەو ئەوەی بەهێزدەبێت ڕێبازی PKK یە.
3ـ پلانی ڕێگەچارەی دیموکراتیانە: لەبەر ئەوەی پلانەکانی هەردوو مادەی سەرەتا هیوایەکی ئەوتۆیان نەداوە و لە هەموو لایەکەوە باجەکەیان قورسە، وای کردووە کۆماری تورکیا بەرەو پرۆژەی دیموکراتیزەبوونەوە بچێت. بەولایەنەوە هەڵکردنی بای پێشکەوتنە هاوچەرخەکان، هاندانەکانی ئەمریکا و ئەوروپا (بۆ تەبایی)، هەروەها مەیلی بەشێکی گەورەی میدیا، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕای گشتی و تەواوی کوردان لەو لایەنەوە، جاری یەکەمە چانسی جێبەجێکردنی پلانی ڕێگەچارەی دیموکراتی زیادی کردووە. لەگەڵا ئەو هەموو ڕووبەڕوو بوونەوەو لەمپەرانەی بەرەی نەتەوەپەرست ـ میللیگەرای فاشیست کە بوونەتە کەمینە، لەبەر ئەوەی دامودەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت لەدژی پرۆژەی چارەسەری ناوەستنەوە و بگرە لە ئامادەکردنی ژێرخانەکەیدا ڕۆڵی گرنگ دەبینن، چانسی جێبەجێکردنی پلانی چارەسەری زیاد دەکات. لەبەرامبەر ئەو ڕەوشە مێژووییە نوێیەدا، ئەو پلانەی چالاکی کە لەنێوان لایەنەکان شایەنی پراکتیزەکردنە، پێویستە بە چەند قۆناخێکدا دەربازبێت. ئەگەر دامودەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەت و حکومەت لەسەر هێڵە ئەستوورەکانی پلانی چارەسەری دیموکراتی پێکبێن و پشتیوانی لایەنی کوردو هێزە دیموکراتیەکانیش وەربگرێت، کردەو قۆناخە شیمانەکراوەکان لەوانەیە بەو ئاراستەیەدا پەرە بسەنێت.

ا ـ قۆناخی یەکەم PKK :بە شێوەیەکی هەمیشەیی قۆناخی بێ چالاکی ڕابگەیەنێت. پێویستە لەو قۆناخەدا لایەنەکان نەکەونە پیلانگێڕیەوە، کۆنترۆڵای سەر هێزەکانیان بەهێزتر بکەن و بەردەوامی بە ئامادەکردنی ڕای گشتی بدەن.

ب ـ قۆناخی دووەم: بە دەستپێشخەری حکومەت و لەمیانەی پەسەندکردنی پەرلەمانی تورکیاوە کۆمیسیۆنی حەقیقەت و ڕێککەوتن پێکبهێنرێت تا لە ڕێگای پێشنیارەکانەوە کۆسپە یاساییەکان نەهێلدرێن و بەمجۆرە یارمەتیدەر بێت. لە پێکهێنانی کۆمسیۆندا پێویستە زۆرترین کۆدەنگی و ڕێکەوتن لەنێوان لایەنەکاندا بە بنەما بگیرێت. پەیوەست بەو دانپیانان و بەرگریانەی لەو کۆمسیۆنەدا ئەنجامدەدرێن، دامەزراوێکی لێبوردن پێشنیار بکرێت و پێشکەشی پەرلەمانی تورکیا بکرێت. ئەگەر کۆسپە یاساییەکان بەو شێوەیە هەڵ بگیرێن، لە ژێر چاودێری دەستەیەکی پێکهاتوو لە بەرپرسیارانی ئەمریکا، ئەوروپا، نەتەوە یەکگرتووەکان، بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کورد و کۆماری تورکیا PKK دۆخی دەرەوەی قانوونی خۆی دەردەخاتە دەرەوەی سنووری تورکیا. دواتر بە شێوەیەکی کۆنترۆڵاکراو ئەو هێزانە لە گۆرەپان و وڵاتی جیاوازدا جێگیر دەکرێن. ئەو خاڵە هەستیارەی لەو قۆناخەدا گرنگە، پلانکردنی ئازادکردنی گیراوانی سیاسی PKK و لە هەمانکاتدا کشانەوەی هێزە چەکدارەکانی PKK یە بۆ دەرەوەی سنوور. پرەنسیپی" یەك بێ ئەوەی تر نابێت" لەجێگای خۆیدایە.

ج ـ قۆناخی سێیەم: ئەوەندەی هەنگاوی دەستووری و یاسایی دیموکراتیزەبوون بهاوێژرێن، زەمینەو هەلومەرجی دووبارە بەکارهێنانەوەی چەك نامێنێت. بەمجۆرە ئەوانەی لەناوPKK دا ئەرکیان هەبووە، یان ساڵانێکی درێژە لە تاراوگە دەژین، هەروەها ئەوانەی مافی هاوڵاتیبوونیان لێسەنراوەتەوەو لە دۆخی پەنابەریدان، پەیتا پەیتا بۆ وڵات بگەڕێنەوە. کاتێك کارو خەباتەکانی KCK یاسایی بوون، ئەوا پێویستی بە کارکردنی PKK لەناو سنوورەکانی تورکیادا نامێنێت. لەهەموو لایەکەوە کارو چالاکی سیاسی، ئابووری و کلتووریە دیموکراتی ـ یاسایی بەبنەما دەگیرێت.

بۆ پراکتیزەکردنی ئەو پلانە قۆناخ بە قۆناخانە، دۆخی عەبدوڵڵا ئۆج ئالان گرنگیەکی ستراتیژی هەیە. چانسی بەڕێوەچوونی ئەو پلانە بەبێ ئۆجالان زۆر سنووردارە. لەو سۆنگەوە پێویستە چارەسەری ماقووڵ سەبارەت بە دۆخەکەی پێشبخرێت.
دەشێت ئەو پێشنیارانە سەبارەت بە ڕەوشی خۆم پێشکەش بکەم:
1ـ لەسەر بنەمای ئەو بەرگریەی لە چوارچێوەی کۆمسیۆنی حەقیقەت و ڕێککەوتندا پێشکەشی دەکەم، ئازادکردنم پێویستیەکی ئەرك و کارکردنە.
2ـ لەچوارچێوەی ئازادیدا، بەڵام لەمیانەی ڕێکەوتن لەگەڵ بەرپرسیارانی ئەو وڵاتانەی لە سەرەوە ناویان هات، ئەمریکا، ئەوروپا، نەتەوەیەکگرتووەکان، بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کورد و کۆماری تورکیا، ئەگەر پێویست بێت نوێنەری وڵاتان و هێزەکانی تریش سەبارەت بە ئامادەکردنی هەموو دەوروبەرە پەیوەندیدارەکانی کورد لەسەرووی هەموویان PKK بۆ چارەسەری دیموکراتیك و گونجاندنیان بەگوێرەی پێویستیەکانی پلانەکە دەرفەتی ئەنجامدانی ئەرکەکانم فەراهەم بکرێت.
3ـ بۆ جێبەجێکردنی پێویستییە جیاوازەکانم، لەسەرووی هەمووشیاندا بەجێبوون پێویستە پشتیوانی بکرێت.
لەو چوارچێوەیەدا دەتوانم بۆچوون و پێشنیارەکانم سەبارەت بە ڕێگەچارەی دیموکراتی و پلاننامەکەی پێشکەش بکەم کە لەلایەن ڕای گشتی تورکیا و زۆربەی زۆری کوردان بەردەوام گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت و لەمن چاوەڕوان دەکرێت. ئاشکرایە کە لەسەر بنەمای ئەو تێڕوانین و پێشنیارانەی لەلایەنەوەکانەوە پێشکەش دەکرێن، دەتوانم تێڕوانین و پێشنیارەکانم ڕەچاو بکەمەوە، بیانگۆڕم و پێشیانبخەم.
بێگومان دوای ئامادەکردنی ئەو ڕاپۆرتە ـ نەخشە ڕێگایە وەك گەڵاڵەنامەیەك، هەڵبەتە گرانترین بەرپرسیاری سەرەتا دەکەوێتە سەر شانی حکومەتیAKP ، پەرلەمانی تورکیاو کاربەدەستانی دامودەزگا سەرەکیەکانی دەوڵەتەوە. ئەگەر هاودەنگیەکی گشتی دروست ببێت، پێویستە یەکسەر لە قۆناخی یەکەمەوە دەست بەکار بکرێت. ئەگەر پێچەوانەی ئەمە رووبدات، لەگەڵ ئەوەی من هیچ کاتێك نامەوێت، بەڵام لە سەرووی هەمویاندا PKKو KCKناچاردەبن هەنگاو بۆ ئەو قۆناخە بهاوێژن کە بە "بەرخودانی سەرتاسەری لەپێناو پاراستنی هەبوونی کوردان و بەدەستهێنانی ئازادی" ناودەبرێت. باجەکەی چی دەبێت بابێت بۆ ئەوەی ڕێگا لەوە بگیرێت، پێویستە بەیەکەوە ڕێگا بە حیسابە سیاسییە ڕۆژانەییەکان و بەرژەوەندی دەسەڵاتخوازان نەدەین، مۆدێل و پلانی کرانەوەی دیموکراتی و چارەسەرکردنی کێشەی کورد جێبەجێ بکەین.

بەشی پێنجەم: ئەنجام

ئەگەر کۆماری تورکیای گەنج لەگەڵ کێشەی کورد بەرەو چارەسەری بچووبوایە، ئەوا بێگومان ئاراستەی مێژوو جیاواز دەبوو. پرۆژە نادیدەکەرەکانی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەسەر ئەو بنەمایە داڕێژراوە کە کوردانیش ڕووبەڕووی چارەنووسی ئەرمەنیەکان بکاتەوە. ڕەوشی سیاسی جیهان و لاوازی ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنی کوردان جەسارەتیان دایە خاوەنی ئەو پرۆژانە. دڵنیابوون کە ئەو سەرکەوتنەی بەسەر ئەرمەنیەکانیاندا تۆمارکرد، دووبارە بەسەر کوردانیشدا بەدەستی دێنن. بۆرژوازیەتی چینی ناوین و بیرۆکراسیەتەکەی کە مێژووی پێش کۆماریان لە مێشکیاندا سڕیبوویەوە، لە مێژبوو کورد لای ئەوان ژێر خاك کرابوو، چیتر وەك بوونێك لە ئارادا نەبوون، بەڵکو جگە لە ئامرازگەلێکی تێکدەرو خراپەکار بەولاوە گوزارشت لەهیچ شتێکی تر ناکەن. ئیتر دەکرێ سیاسەتەکانی ئاسیمیلاسیۆنیان لەسەر پەیڕەو بکرێت. ئەو پاکتاوە جەستەییەی کە لەسەر ئەرمەنیەکان بەڕێوەچووە، دەتوانن لەسەر بنەمای کلتووری لەسەر کوردانی بەڕێوەببەن. نەوەپەك جێگای باسە کە بەهیچ شێوەێك لە ڕێبەرەکانی تورکیا ناچێت کە لەهەموو قۆناخەکانی مێژوویاندا لەگەڵ ڕێبەرەکانی کورد ڕێککەوتنی ستراتیژییان پێشخستووە. بەردەوام کۆمار ئەو نەوەیەی گەورەکرد. نکوڵیکردن لەکوردان وەك یاسایەکی بێدەنگی پۆڵایین بەدەستهێنانی پێگەی پیاوێتی و دەسەڵات بوو. هیچ پلەو پایەیەك نەمابوو لەسەر بنەمای وازهێنان لەکوردایەتی بەدەست نەهێنرێت. بەتەنیا لەسەر ئەو بنەمایە دەیانتوانی لە ناو هەموو قۆرخکاریەکانی مۆدێرنیتەدا جێگا بگرن.
تا دەرکەوتنیPKK ، نارەزایەتیەکی لاوازو دەنگێکی کپ لەبەرامبەر ئەو نکوڵیکردن و لەناوبردنە کلتوورییە جێگای باسبوو کە وەك هەڕەشەیەکی مەترسیدار لە PKK ی دەڕوانی. پێویست بوو ڕوونەدات، بەڵام ڕوویدا. ئەو چارەکە سەدەیەی دوایی کە تەنیا بە وشەی"نائاسایی"و "مەترسیدار" پێناسە دەکرێت، لە ئاستێکی پێویستدا سەلماندوویەتی کە ئەو ڕێگایەی گیراوەتە بەر تەنیا تاوانێك نییە لەبەرامبەر مرۆڤایەتی، بەڵکو لەلایەنی مادی و مەعنەویشەوە تا دوا ڕادە زیانبەخش وماڵوێرانکەر بوو. ئەو ڕێگایە سەرکەوتنی نابێت. لە ڕاستیدا کۆمار لەسەر بنەمای ڕێککەوتنێکی تەندروستانەی فاکتەرە دیموکراتییەکان دامەزراوە. کوردیش یەکێکە لە ئەندامە دامەزرێنەرەکانی ئەو ڕێککەوتنە. پرۆژەی مۆدێرنیتەی قۆرخکار کە بەدەستی دەوڵەت بەڕێوەدەچوو، بەڕیاربوو کە هاوپەیمانەکانی تری وەك سۆسیالیست و ئوومەتپارێزە ئیسلامیەکان لەناو سیستەمدا نەهێڵێت. لێگەڕینەکانی نەتەوەی لێکچوو(هۆمۆژەن) لە ئاستی هاربووندا لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کراو هەوڵی جێبەجێکردنی درا.

به پێچەوانەی بانگەشەکانەوە، ئەندازیاری ئەو پرۆژەیە مستەفا کەمال نییە، بەڵکو کادیرە ئیتیحادگەراکانن. وەك چۆن سوڵتان عەبدولحەمیدیان بەکارهێنا، بەهەمان ئەو تاکتیکانە هەوڵیاندا مستەفاکەمالیش بەکاربێنن. لەناو ئەو کادیرە ئیتیحادگەرایانەدا گەڕان بە دوای پیلانی لەناوبردنی کوردان بۆ دەستنیشانکردنی راستی گرنگە. هاوپەیمانێتی سێوی سوور کە تا ئێستاش بەرەی نەتەوەگەرا ـ میللیگەرا بەڕێوەی دەبات، ناوەڕۆکێکی فاشیستانەی هەیە، وەك دژە تێزی هاوپەیمانێتی دیموکراتییانەی کاتی دامەزراندنی کۆمار پێشخراوە. کۆمیتەگەرایی و کودەتاکردن شێوازە سەرەکیەکانیان بوو لەناو دەوڵەتدا. لەناو ئەمریکاو پێشتریش لەناو ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا پشتیوانی باشیان دۆزیبوویەوە. لە"60"ساڵی دواییشدا لەمیانەی پشتبەستن بە گلادیۆی ناتۆ کۆمەڵگایان لەخوێندا گەوزاند. بەشێوەیەکی سیمبۆلیش بێت، دادگایکردنی ئەرگەنەکۆن گورزێکی گەورەی لەو هەوڵانەیاندا کە دەیانەویست لەناو دەوڵەتدا ببن بە دەوڵەت. ئەو رەوشە لە دۆخی لەناوبردنی ئاغایەتی یەنی چەری سەردەمی سوڵتان مەحمود دەچێت. یەنیچەریەکان کە جگە لە رووخاندنی پادشاکان و لەسێدارەدانی سەدرولئەعزەمەکان بەولاتر هیچ سوودێکی تریان نەبوو، لەساڵی"1826"دا لە رێگای هێرشێکی خوێناوییەوە لەناوچوون. تەنیا بەو شێوەیە رێگا لەبەردەم تەنزیمات و مەشروتیەتدا ـ دوو پرۆسەی چاکسازین لە کۆتایی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ـ کرایەوە.
"یەنیچەریە ئیتیحادگەرا مۆدێرنەکان" کە بەلای کەمەوە خاوەن رابردوویێکی سەد ساڵەن، تەنیا بە پاڵنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ رووخان نەوەستاون، بەڵکو لە ماوەیەکی کورتدا کۆماری تورکیای خاون رابوونی دیموکراتییان بۆ دەسەڵاتدارێتیەکی دەستپۆتیك وەرچەرخاند. هەمان زهنیەت و بونیادەکانی بە سیفەتی نەتەوەگەراو میللیگەرایی لەجیاتی پارێزگاری ئیمپریالیزمی ئەلمانیا، پشتیان بەست بە پارێزگاری ئیمپریالیزمی بەریتانیا و ئەمریکا، ئەمجارەش ئەو شەڕەی لەو دە ساڵەی دوایی لەناو دەوڵەتدا بەناوی ئەرگەنەکۆنەوە لەمیانەی گەلەکۆمەو ئاژاوەگێری بێ هاوتاوە بەڕێوەیاندەبرد، سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. هۆکارەکەشی ئاشکرایە؛ پشتیوانە سەرەکیەکەیان ئەمریکا دەستبەرداری پشتگیریکردنیان ببوو. لە رووسیا، چین و ئێران گەڕانیان بەدوای پشتیوانێك، هەروەها گەمەی ئەوراسیاچیەتی جێگای سەرنج نەبوو. یاریکردنیان بە کارتی کەمالیزمیش لە ئاستی کاریکارتێردا مایەوە. هەرچەندە هێزی بەرگریکردنیشیان نەبێت، بەڵام پێویستە وەك زهنیەت و بونیادی بیرۆکراتیك، پاشماوەو نوێنەرە سیاسیەکانیان بچووك نەبینرێت. هەرچەندە نەتوانن لەناو دەوڵەتدا سەرلەنوێ هەژموونگەرایی خۆیان ئاوابکەنەوە، بەڵام دەتوانن کرانەوە دیموکراتیەکانی تورکیا بشێوێنن و بێناوەڕۆکی بکەن، لە ئاراستەی چارەسەرکردنی دەربخەن و پووچەڵی بکەنەوە. لەوانەیە ئەزموون و هێزەکەیان بەشی ئەوە بکات.
گۆڕانکاریەکانی کە لە رۆژهەڵاتی ناوین و تورکیا روودەدەن، ئەو قەیران و کێشانەی کە رێگایان لەبەردەم کراوەیە، تەنیا لەمیانەی کرانەوەی دیموکراتییانەی فراوانەوە چارەسەر دەکرێت. لەم بوارەوە هزرو بونیادی تورکیا چانسی بوون بە مۆدێلی هەیە. هاوشێوەی ئەو مەرجانەی رێگایان لەبەردەم لە دایکبوونی کۆمار کردۆتەوە، ئەمجارەش بۆ وەرچەرخانی دیموکراتی کۆمارو کرانەوەی دیموکراتی جێگای باسە. جارێکی دیکە خۆ دووبارەکردنەوەی مێژوو دەسەلمێنرێت، بەڵام بەشێوەیەکی نوژەنەوە. دەشێت هەمان شت سەبارەت بە کوردانیش بگوترێت. جارێکی دیکە رووبەڕووی بینینی یەکێك لەو رۆڵانەن کە لە تەواوی هاوپەیمانێتییە مێژووییەکانی ئەنادۆڵ ـ میزۆپۆتامیادا بینیویانە. ئەوانیش ئیتر کوردی جاران نین. خۆیان نوێکردۆتەوە، رێکخراون و خاوەن چالاکین. هەروەها کۆنەپەرستی ناوخۆ، مەحافازەکارو پیلانگێرەکانی هەردوو لایەنەکە لەوانەیە بیانەوێت درێژە بە رۆڵە مێژووییەکەیان بدەن.
ئەمریکای هێزی هەژموونگەرایی جیهانی، دەزانێت کە لە رێگای گلادیۆی ناتۆوە ناتوانێت سەرکەوتووبێت. دوای هەڵوەشانەوەی بلۆکی سۆڤیەت مانای گلادیۆ نەمابوو. لە ئەنجامی هەوڵە زۆرەکانی دەسەڵاتدارانی تورکیا، تاکو تشرینی دووەمی "2007" سەبارەت بە هەبوونی گلادیۆ لە تورکیا رازیکران. لە راستیدا "25" PKK ساڵی دوایی بەشەڕکردن لەگەڵ گلادیۆی تورك بەسەر بردبوو کە لەژێر چەتری ناتۆدابوو. ئاستی مەترسیداری ئەو کارە، لەوەدایە تازە بەتازە دەرکی پێدەکرێت کە بەناو دووەمین کارەساتی هاوشێوەی ئەرمەنیەکان دەرباز بووین. بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا، ئیسرائیل و یەکێتی ئەوروپا سەبارەت بە رۆژهەڵاتی ناوین و کوردستان، لەگەڵ گلادیۆی رابردوو لەناو ناکۆکی دابوو. ئەو رێکەوتنە نوێیەی لەگەڵ دامودەزگاکانی کۆماری تورکیاو حکومەتەکەیدا ئەنجامیاندا، بەلانی کەم لەسەر بنەمای دژایەتی کردنی گلادیۆی کۆن و دەربازکردنی بوو. لەبەر ئەوەش دیارترین کۆسپی دەرەکی بەردەم کرانەوە دیموکراتیەکانی تورکیا لاواز دەبوو. چیتر کودەتاچی و پیلانگێرەکان وەك رابردوو پشتگیریان لێناکرێت. بەڵام ناشێ لەبیریش بکرێت کاتێك پێویست بکات ئەوا لەدەست بەکارهێنەرەکانیان لە ئامادە باشیدان. وەك چۆن کۆماریش سەرەتا لەمیانەی پاشماوەی هاوشێوەوە هەوڵی ئاستەنگکردنی درا، دوای دامەزراندنیش بۆ بەربەستکردنی پێشکەوتنەکەی سوود لەو جۆرە بونیادانە بینرا، ئەگەری هاوشێوە لەبەردەم دیموکراتیزەبوونیشدا هەیە. ئەگەر مێژوو گەنجینەیەکی بێ هاوتای پەندو وانە بەخش بێت بۆ ئێستای بەرامبەری وەك دەرفەتێکی ئازادی، دەتوانرێت هەتا دوایی سوودی لێ وەربگیردرێت.
هەڵمەتی KCK ی کوردان کە خۆیان نوێکردۆتەوەو بۆ کرانەوەکانی شارستانێتی دیموکراتی ئامادەیەو "PKK"ش کە وەرچەرخانی دیموکراتییانەی ئەنجامداوە، گونجاوترین ئامرازی ئاشتی شەرەفمەندانەو سیاسەتی دیموکراتییانەیە نەك شەڕ. ئەو تایبەتمەندییە سەرەکییەی مانای گەرەنتیەکی بەهێزی تورکیای دیموکراتیشە. رێککەوتنی مێژوویی نێوان ئەنادۆڵا و میزۆپۆتامیا، لە رۆژی ئەمڕۆشدا وەك تورکیای دیموکراتی و

کوردستانی ئازاد، ئازاری لەدایکبوون بەخۆیەوە دەبینێت. بۆ ئەوەی دەرفەت بۆ تێکدەرەکانی ناوخۆو دەرەوە نەڕەخسێت، تۆزێك گوێ لە مێژوو بگرین بەسە. ئەوانەی دەزانن گوێ بگرن، مێژوو قیبلە نومای راستییەو قەت هەڵە ناکات. هەرچی پشتبەستنە بە کۆمەڵگاو خەڵکی وڵاتی دیموکرات و ئازادیش، بەردەوام سەرچاوەی هێزو ئیلهامە بۆ ئەوانەی دەزانن تێکۆشان بکەن.
لە رەوشی جێبەجێکردنی "کرانەوەی دیموکراتی و مۆدێلی چارەسەرکردنی کێشەی کورد" کە دەتوانێت ببێتە وەڵامی راستیەکانی مێژوو و هەلومەرجی ئێستای تورکیا، ئەوا تەنیا بە مانای ئازادتر هەڵقووڵانی مێژوو بۆخۆی سنووردار نابێت، بەڵکو دەبێتە رێگای پێشکەوتنی دیموکراتی، ئازادو یەکسانی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوینیش. پێشکەوتنی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لەبەرامبەر دەستبەسەرداگرتن و داگیرکاری فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر کلتووری ناوچەکە، ئەوا دەرفەت و هێزی وەرچەرخان بۆ سیستەمێکی گونجاو لەگەڵا راستینە مێژووییەکانیدا بەدەست دەخات. لەوانەیە بۆ جاری یەکەم مێژوو لە نووسینەوەی مێژووی دەستبەسەرداگرتن و داگیرکاری و هەرجۆرە فەتحکردنێك رزگاری ببێت، وەك مێژووی کۆمەڵگایەك بنووسرێتەوە کە لە ژیانی تاکە دیموکرات، یەکسان ـ ئازادەکان پێکهاتبێت.

15ئابی 2009
عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
زیندانی تاکە کەسی دورگەی ئیمرالی